**سەرپەرشتیاری گشتی**
**شێرکۆ بێکەس**

**ڕاوێژکار**
**ئەکرەم قەرەداخی**

**سکرتێری ڕۆڤار**
**یاسین عومەر**

**سەرپەرشتیاری هونەری**
**قادر میرخان**

**مۆنتاژی کۆمپیوتەر**
**ئاسۆ سەعید**

**سەرپەرشتیاری چاپ**
**فەرهاد ڕەفیق**

**ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوومانگ جارێك دەریدەكات**

**ناونیشان**
**سلێمانی– شارێی سالم**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

**لە دەرەوەی وڵات**
**Tel: 00441628477660**
**Fax: 00441628486008**

**Web Site**
**www.sardam.info**

**Email**
**Sardam@sardam.info**

**چاپخانەی ڕەنج**

**مەسعود محەمەد..**

بیریاری ناوداری کورد, مامۆستا مەسعوود محەمەد, ساڵی ١٩١٩ لە باشووری کوردستان، لە شاری کۆیە، لە دایک بووە, مرۆڤێکی حەقپەرستی، مرۆڤدۆستی کوردپەروەر بوو. خاوەنی چەندین شاکارە لە بواری هەمەجۆری. زمان، ئەدەب، مێژوو، کۆمەڵایەتی و فیکر بە کوردی و عارەبی, لە بەرهەمەکانیدا داکۆکی لە ئازادیی بیر دەکات. فیکر و بۆچوونی باو دەکاتە بابەتی لێکۆڵینەوە و ڕەخنە لە دیدی ماددیی جەدەلی دەگرێ و داکۆکی لە مرۆڤ دەکات. بە بۆچوونی مەسعوود محەمەد مرۆڤ تاکە خالیقە. دین و ئایدیۆلۆژیا دیاردەی کۆمەڵایەتین. ڕۆژی ١-٤-٢٠٠٢ لە شاری هەولێر، کۆچی دوایی کرد. چەندین کتێب و وتاری نایابی بە زمانی کوردی و عەرەبی بۆ بە جێهێشتوین, کە بریتین لە:

**١. چەپکێك لە گوڵزاری نالی**

... «بەچکە کوردێکی شارەزووری، نەداری، هەژاری بێ ناز و نیاز، ئالوودەی ئارەقە و ئەرك و زەحمەتی پڕ تەپوتۆزی «خاکوخۆڵ»، گیرۆدەی چەندین تەنگوچەڵەمە و چەکمەسازیی حاڵوباری ناگزوور و بێ شەوق و زەوق، دەسە پاچەی کۆمەڵایەتی - ئابووری - ڕامیاریی ژێر قەمچی و زەبروزەنگی ڕژێمی نیوە شارستانانە، تەکان خواردووی بێنە و بەرەی گوریسکێشەکێی نێوان ئێران و عوسمانلی، ڕۆڵەی میللەتێکی هەرگیز خۆشی نەدیتووی بە ئەبەد ڕێز لێنەگیراو و تێنەخوێندرایەوە، ئاکامی موعادەلەی چەندین عامیلی زانراو و نەزانراوی هەرچی هۆی سەرەژێربوون و بەخۆدا شکاندنەوە و دالەنگان و کەمایەتی و نزم بوونەوە و چوونەوەیە... غەزەب لێگیراوی قەدەر... مۆرلێدراوی چارەڕەشی... خدری ئەحمەد شاوەیس... نالیی شارەزەووری... سەردەفتەری هەڵبەستی کوردی لە هەموو سەدەی نۆزدەمدا... گەوهەرسنجی کانگای واتا و جوانی و عیشق... شیرازەهۆنی خولیا و خەیاڵ و ئەفسوون... جێگەی شانازی و سەربڵندیی هەڵبەستی کوردی لە ئاست ئەدەبی جیهانی مسڵمان... تێهێنەرەوەی ئابڕووی مەعنەوی لە تەك دالەنگانی تەرازووی دەسەڵات و سامان و کیانی کورد... ڕووتەڵەی بەخۆ نازیو... هەژاری گەردەنکێل... ئاوارەی بێنیاز... ئەمانە و چەندین وێنەی تری دەستبەتاڵی و دڵتێری، فەخر کردن و تەوازوع، بڵندنۆڕین و خاکنشینی، خۆ بە کەم گرتن و فیز و ناز...»

**٢. بۆ ئەمیری حەسەن پور لە هەر کوێیەك بێت**

لەو چەند دێرە ئامۆژناکەیدا کە داوامان لێدەکا «ژێربەنا و ڕووبەنا – ژێرخان و ژوورخان» تێکەڵ بەیەکدی نەکەین ڕوومان بەرەو دەستوورێک دەکا کە دەمانگەێنێتە ئاکامی ئەوتۆ کە مامۆستا ئەمیر نایەوێ لە خەون و خەیاڵیشدا بیانسەلمێنێ: کە پێت بڵێم «ماهیە» و «عرض» ی مرۆڤەکە خۆی تێکەڵ مەکە یەکسەر دەرەبەگ و جوتیار پارەدار و کرێکار و داگیرکەر و داگیرکراو و عەبد و خاوەنەکەی هەموویان دەچنە ژێر یەک سەرەناوەوە چونکە «ماهیە»ی هەموویان مرۆڤایەتییە هەرچی پارە و موڵکداری و داگیرکردن و ئازادی و عەبدایەتی و ئەو جۆرە خەسڵەتانە هەیە هەموویان «عرض» ن و لە لاوە هاتوونەتە سەر مرۆڤەکەوە، بە تەواوی وەک کە مامۆستا ئەمیر دەیەوێ لێی بسەلمێنین«ماهیە»ی دەرەبەگایەتی کورد و فارس و ئینگلیز یەک چشتەو بەوە لەیەکدی ناترازێن کە «عرض»ی وەک ئایین و ئەدەب و هەژاری و سامانداری و داد و ستەم و پێشکەوتن و پاشکەوتن و دەسەڵات و ژێردەستی لە کوردەوە بۆ ئەڵمان دەگۆڕێن.

**٣. مرۆڤو دەوروبەر**

لە سێ بەرگ پێکهاتووە. بەرگی یەکەم - 1977 - بەغدا، وەشانی کۆڕی زانیاری کورد. بەرگی دوەم - 1984 - بەغدا، وەشانی کۆڕی زانیاری عیراق. بەرگی سێیەم - 1999 - لەتەك بەرگی یەکەم و دووەم، لە لایەن وەشانی «کیتابی ئەرزان» - ەوە - لە ستۆکهۆڵم - بڵاو کراوەتەوە.

**٤. لەپەرۆشەکانی ژیان**

ئەم کتێبە، سەرەتا بە عارەبی نووسراوە و لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەمد لە بەغدا – بە ناوی «من هموم الحیاة» - بڵاوبۆتەوە. لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا نووسەر خۆی تەرجەمە ی کوردی کردووە و لە ستۆکهۆلم – لە لایەن کیتابی ئەرزانەوە - بڵاوکراوەتەوە. کتێبەکە بریتیە لە سێ وتاری سەربەخۆ.

**٥. دەستەودامانی نالی**

«مێژساڵێکە مەراقی کارێکی پێویست سەرشانی ئەدەبدۆستیی کوردەواری هەستم دەڕووشێنێت و دنەم دەدات و دەستم پێی ناگات. دەمەوێ پاتەوپات و بێ مەرایی بڵێم شەرحەکەی دیوانی نالی، لەلایەن مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مووددەڕیس و، گیانشاد، فاتیحی ڕۆڵەی بێگەرد و بێتەفسیریەوە، کە خانەی وێرانی «خاکوخۆڵی» بۆ کورد و کوردستان سەرلەنوێ ئاوەدان کردەوە و بێن و بەرامەی گوڵستان و بۆستان و بەهارستانی ئەدەبی پەردەپۆشی کەڵەشاعیری کوردی لە دەماغی خەیاڵ و خەون و خولیای هەموو هەستەوەری ناسك گێڕا، کاتی ئەوە هاتووە ئەگەر نەڵێم پیر بووە...»

**٦. گەشتی ژیانم**

«گەشتی ژیانم» بیرەوەییەکانی مامۆستا مەسعوود محەمەدە. نووسەر لە نزیکەوە ئاگاداری دنیای دوور و نێزیکی خۆی بووە. باری کۆمەڵایەتی، مەیدانی فیکر و ڕەوتی سیاسەتی ئەو دەمەی کوردستان بەشێکی بەرچاوی ئەم گەشتەن. باسکردنی ئەو ڕووداوانە بەم خامە ڕاستگۆیەی مامۆستا ئەم بەرهەمە دەکاتە شاکارێکی نایاب و سەرچاوەیەکی هەرە بەرزەی بواری خۆی.

ئەم کتێبە، لە سەرەتادا، بە چەندین زنجیرە لە گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» دا لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا بڵاو کراوەتەوە. پاشان 1992لە ستۆکهۆڵم وتارەکان لە یەك کتێبدا کۆکرانەوە و چاپ کران.

**٧. زاراوەسازی پێوانە.. ٨. حاجی قادری کۆیی..٩. چەندینی تر**

# چەپكێك لە گوڵزاری نالی

مەسعود محەمەد

## پێشەكی

پەندە مەندە مەشهورەكەی كوردی كە دەڵێ (چەم بێ چەقەڵ نابێ) لە جیهانی جانەوەر و ڕوەكەوە وێنەیەكی خواستۆتەوە و بەسەر جیهانی مرۆڤی دابڕیوە. گوتەی (بێ چەقەڵ نابێ) بۆ خۆی ئیشارەی بەهێزی تێدایە بۆ بوونی جانەوەری لە چەقەڵ بە پشتەوە تا دەگاتە شێر و پڵنگ و بەور. چەم، بەعادەت، گیاو درەخت و جانەوەرێكی كە تێیدایە، بابەتی لەیەكتر نزیك‌و هەم ئاهەنگ و یەك ڕێكارن. ناوناوە لێرەو لەوی درەختێكی سەركەش وەیا گوڵێكی یەكجار گەش وەیا جانەوەرێكی زێدە بەهێز خۆی لە ڕیزی ئاوەڵەكانی دەردەبا و ژووررووی ڕێكاریان دەكەوێتەوەو دەبێتە پەنجەنیشان، ناو و ناوبانگی هەڵكەوتویی دەردەكات. میللەتانیش، وەك چەم، بە پێی دەستورێكی بەرچاو بنجیی سروشت و كۆمەڵایەتی، زۆربەی تاكەكانی خزمی یەكترن، هەرچەند خزمایەتی تەواو نە پەیدا دەبێت و نە پەیدا بوونیشی سودبەخشە بۆ مرۆڤ، چونكە هاوتایی و هاوسەنگی تەواو لە نێوان تاكەكاندا كاتێك مومكین دەبێت كە مرۆڤیش وەك ئالەت لە كارخانە دەردەچێت و قاڵبگرتوو بێت، كە ئەمە لە نێوان مریشكی مەكینە هەڵێناویشدا بەدی ناكرێت.

جوداوازی قابلیەت لە تاكێكەوە بۆ تاكێك كە دیاردەیەكی گشتی و جیهانی و هەمیشەییە، وا دەبێ لە سنووری جوداوازی عادەتی دەردەچێت و مەودایێكی بەرچاو لە یەكتریان دوور دەكاتەوە، هەروەك پێچەوانەی پێشكەوتن كە پاشكەوتنە، ئەویش ناوناوە لە عادەت بەدەر دەبێ و دەگاتە پلەی دەبەنگی و گێلی تا سەر بەشێتییەوە دەنێت.

جوداوازی بەرەوپێشەوەی تاك لەچاو تاكەكانی تر لە مەیدانی بێ ئەژماردا خۆی دەنوێنێ نەك یەك مەیدان دوو مەیدان، هەر یەك لەو بەرەوپێش چوونانەش نرخ و سەنگ و بایەخی خۆی هەیە لە ناو گەلدا: دەنگخۆشی، جوانی، دەستڕەنگینی. هێز، نوكتەبازی، هونەركاری، خەتخۆشی، پسپۆڕی لە كەسب و كار، شارەزایی،



سوارچاكی، سەرناسی، شوێنهەڵگری، زیرەكی، چالاكی، خۆشبەزی ماندونەبوون، مەلەوانی، كابانپوختی، زانایی، وەستایی... تەنانەت فێڵبازیش هەموویان هۆی هەڵاواردنی خاوەنەكانیانن لە زۆربەی خەڵق. گەلێكیش لەو خاسیەتانە دەگاتە پلەیەكی هێندە هەڵكشاو كە بە دەگمەن نەبێ تاكیشی ناگاتێ. واتە هەموو ئەو خاسیەتە تایبەتیانەش پلەی خوار و ژووریان هەیە تا ئەو ڕادەیەی كە بەیەكەوە كۆ نابنەوە و ناچنە ژێر عینوانێكەوە. هەرچەندە دەزانین (قابلیەت) بە تەجرەبە و فێركردن و ڕاهێنان تیژتر و بە بڕشتر دەبێ و لەكار نەهێنانیشی كولی دەكات و بەرەو كوژانەوەی دەبات، دیسان دەبێ بزانین (قابلیەت) هەیە زگماكە بە فێركردن و ڕاهێنان خەڵق ناكرێت. تەنانەت ئەگەر خەڵقیش بكرێ لە پلەیەكی نزمدا دەمێنێ كە ڕەنگە ئەرك و مەسرەفەكەی لێ خەسار بێ. تۆ دەتوانی بەهۆی ئامۆژگاری مۆسیقاوە دەنگ ناخۆشێك فێری

گـۆرانی بکـەیت بـەڵام ئـەم دەنـگ ناخۆشـە هـەرگیز ناچـێتە ڕیـزی پێشەوەی گۆرانیبێژانەوە. هەروەها هەمان ئامۆژگاری مۆسیقا دەنگ خۆشی زگماك بەرەو پێش دەبات تا سنوری بلیمەتی، لە هـەردوو حاڵیشدا مەودای جوداوازی نێوان دەنگناخۆش و دەنگخۆش هـەر دەمێنێتەوە.

ئەدەب بە تێکڕایی یەکێکە لەو مەیدانە فکریانەی کە بەشێکی هەڵکەوتووی میللەت تێیدا دەتوانن بژین و پەروەردە بن، چونکە ئەدەب قابلیەتێکە بەندە بە خاسیەتی زگماکەوە، کە خەڵق کردنی زۆر ئەستەمە. وەك دەزانین ئـەدەب، سـەرەڕای بـوونی قابلیـەتی زگمـاك، پێویـستی بـە خوێنـدن و فێربـوون و مـشت و ماڵـدان و تەجرەبەو لەکارهێنان و چەندین ئەرك و زەحمەتی تریش هەیە کە ئەگـەر لێیـان دابـڕێ هـەر دەمێنێتـەوە خـۆی و بڕشـتی قابلیەتـە زگماکەکەی.

یـەکێك لـە مەیدانـەکانی ئـەدەب مەیـدانی هەڵبەسـتە کـە ئـەویش هـەمان دەسـتووراتی بـەرەوپێش چـوون و وەسـتان و دواکـەوتنی بەسـەردا دێـت کـە بەسـەر قابلیەتـەکانی تـردا دێـت، بـەڵام کـە بێین هەڵبەست بە پەخشان بگرین هەندێ جوداوازی لە نێوانیـان دێنـە بەرچاو لە ڕووی پێویستی بەرەوپێش بردنەوەیانەوە. پەخشان کە خـۆی زادەی سروشـتە و لـە بنەڕەتـدا بەرهـەمی هەڵکەوتنـە نـەك پەیداکردن، هەر لە هەمان ڕێگەی ئەو تایبەتیانەی کە لە هەڵبەستی جودا دەکەنەوە، پتر لە هەڵبەست دەشێ بە هۆی تەجرەبەو مەشق و ڕاهاتنـەوە بـەرەوپێش بـڕوات. قابلیـەتی بوێـژی کـە کێش و قافیـە و مۆسیقا دەخاتە ناو پەخشانەوە و دەیکا بە هەڵبەست، پتر بەندە بە هەڵکەوتنی سروشتی و زگماکەوە لەچاو پەخشاندا، کەمتریش لە پەخشان قەرزداری ڕاهاتن دەبێ، هـەروەك دەنگخۆشـی و مـەهارەتی هونـەری پـتر لـە سوارچاکی زەنـەی دەروونـن، کـەمتریش لـەو زادەی مەشقن.

مەیــدانی هەڵبەســتی کــوردی لــە ســەردەمی نۆزدەمــدا ئــەم جوداوازییەی پلەی پێشکەوتن و سەرەژوورچوونە لە بوێژێکەوە بۆ یـەکێکی تـر بـە ئاشـکرایی تێـدا دەدیترێـت. بوێـژی کـورد هەیـە لـەو سەدەیەدا گروگاڵێکی مندالانـەی لاسایی و خۆتێهەڵسوونی کردوە کە بە هیچ مەزهەبێك و لێبووردنێك و خاترگرتنێك ناوی شیعری پێ ڕەوا نادیترێ هەرچەند ناوناوەش ئەو جۆرە بوێـژە لەلایـەن هەندێ کەسانی ناشارەزای شیعر بە بوێژ لە قەڵەم دراون، ڕەنگە پلەشیان بەرەوژوور بردرابێ، کە ئەمە کارێکە نە بایەخی هەیە و نە دەشتوانێ ڕاستی بگۆڕێ وەیا بڕیاری کێشانە و پێوانـەی (بوێـژی) بـە هەڵـە ببـات. ئـەو کەسـەی بوێـژ نیـە بـە پێداهـەڵگوتن و بخـور لـە دەورە سووتاندن ناکرێ بە بوێژ هەروەك مێزەر و جبە مەلا دروست ناکات. وا دەزانم دوای بەسەرچوونی کڑی عاتیفە و هەڵپەی سۆز، هەرکەسە جێگەی ڕاستەقینەی خۆی پێ لە تەك ئەو تەرزە زرە بوێژانـەدا هـی

واشمان هەیە تا بوێژی هەرە پێشکەوتوو پێگەیشتوو و دەسـەڵاتدار و هونەرمەندی ڕۆژهەڵاتی مسڵمانە. هەرچەندە ئەم جۆرە شاعیرەی کورد لە نێوان گەلانی مسڵماندا شۆرەتی یەکێکی وەك خۆی وەیا لـە خۆی بەرەژێرتری تورك و فارس و عەرەبی وەریش نەگرتبێ، هۆی شۆرەت نەبەستنی ناگەڕێتـەوە بـۆ نزمـی پلـەی شاعیریەتی، بـەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ بێدەسەڵاتی میللـەتی کورد، کە ئەمـەش ئەنجامێکی کوتوپڕ بە یەکسەری دەستووراتی مرۆڤایەتییە بە تێکڕایی، کـەوا نـەك هـەر لـە مەیـدانی شیعردا خـۆی سـەپاندووە بگـرە لـە هـەموو مەیدانێك فەرمانڕەوایە: قارەمانی میللەتێکی بێدەسەڵات بە قەدەر پاڵەوانپفێکی میللەتەی خاوەن کیانو سامان و هێز و دەسەڵات ناوی نایـەت، هـەروەهاش هـەموو بلیمـەت و زانـا و هونـەرکارەکانی کـە زۆریان لەبەر بێ خاوەنی وەك پشکۆی ئاگر ووردە ووردە دەبن بە خۆڵەمێش و ناویان لە ڕووپەڕەی ژیان دەسڕێتەوە.. زۆر بە داخەوە یەکێك لەو بوێژانەی کورد کەبە ڕاستی و بێ موجامەلە لەگەڵ خۆدا کـردن لـە ڕیـزی هەرەپێـشەوەی بوێـژانی مـسڵمانەوە دێـت، زۆر جـارانیش لـە تـاك تاکـە بـەیت و دوو بەیتـدا بـەرایی لـە زۆربـەیان دەگرێت ئەگەر نەڵێم لە هەموویان مەلا خدری (نالی)یە.

بەچکە کوردێکی شارەزووریی نـەداری هـەژاری بێ ناز و نیاز، ئـالوودەی ئارەقـە و ئـەرك و زەحمـەتی پـڕ تـەپوتۆزی (خـاکوخۆڵ) گـیرۆدەی چـەندین تـەنگ و چـەڵەمە و چەکمەسـازی حـاڵ و بـاری نـاگزوور و بـێ شـەوق و زەوق، دەسپاچـەی کۆمەڵایـەتی– ئـابوری– ڕامیاری ژێر قەمچی و زەبروزەنگی ڕژێمی نیوە شارستانانە، تەکان خــواردووی بێنەوبــەرەی گــوریس کێــشەکێی نێــوان ئێــران و عوسمانلی، ڕۆڵـەی میللـەتێکی هـەرگیز خۆشی نـەدیتووی بە ئەبەد ڕێـز لێنـەگیراو و تـێ نەخوێندرایـەوە، ئاکـامی موعادەلـەی چـەندین عــامیلی زانــراو و نــەزانراوی هەرچــی هــۆی ســەرەژێربوون و بەخۆداشــکانەوەو دالــەنگان و کەمایــەتی و نــزم بوونــەوەو چــوونەوەیە... غــەزەب لێ گــیراوی قــەدەر... مــرۆ لێ دراوی چارەڕەشی... خدری ئەحمەد شاوەیس... (نالی)ی شارەزووری... سـەردەفتەری هەڵبەستی کـوردی لـە هـەموو سـەدەی نۆزدەمـدا... گەوهـەر سـنجی کانگـەی واتـا و جـوانی و عیـشق... شـیرازەهۆنی خولیـا و خـەیاڵ و ئەفـسون... جێگـەی شـانازی و سـەربڵندی هەڵبەسـتی کـوردی لـە ئاسـت ئـەدەبی جیهـانی مـسڵمان... تـێ هێنەرەوەی ئابڕووی مەعنەوی لە تەك دالەنگانی تەرازووی دەسەڵات و سامان و گیانی کورد... ڕووتەڵەی بە خۆنازیو... هـەژاری گـەردەن کێـل... ئـاوارەی بـێ نیـاز... ئەمانـەو چـەندین وێنـەی تـری دەسـت بـەتاڵی و دڵتێـری، فـەخرکردن و تـەوازع، بڵنـدنۆڕین و خاکنشینی، خــۆ بەکــەمگرتن و فیزونــاز کــەوا لــەم نمونانــەی گۆنــاگۆنی هەڵبەستەکانی دەردەکەوێت:

یا گەدایێکی غەنی یا پادشاهێکی فەقیر
لەم دوە خالی نیە (نالی) لە ڕووی حەددی وەسەط
ئەم سەرسەری بازانە کەوا هەمسەری بوومن
موشکیل بگەنە ساعیدی شاهێکی وەکو من
نالی کە غولامی مەدەدی زولف و برۆتە
شاهێکە لەبن سێبەری باڵی دو هومادا
زاهیر و باطین لەسەر لەوحی حەقیقەت یامەجاز
ئاشنای سێرڕی قەڵەم بێ غەیری نالی کەس نەما
شیعری خەڵقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی
کەی لە دیققەتدا پەتك داوا لەگەڵ هەودا دەکا
قلابی جیهان نەقدی عیاری نیە قوربان
نالی محەکی هیممەتی کردویە موجەڕڕەب
بۆ مەشقی عیشقی زوڵفی نیگاری نیگارشی
نالی لە خامەدا بوەتە شاهی طوڕڕەنووس
نالی عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا
مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچووك
فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بە دەفتەر گرتوە
نالی ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە دیوانی هەیە

ئەوجار:
نالی و مەسەلی حاڵی لە ئەشکنجەیی غەمدا
وەك ناڵە لە نەیدا وەکوو نالە لە قەڵەمدا
نالی خەبەری بێ ئەسەری غائیبە ئەمما
نالێکی حەزین دێ لە موناجاتی سەحەردا
چ خۆشە من وەکو تازیی بنۆڕم
ئەتۆش هەروەك غەزالەی بەڕ هەڕاکەی
خاکی دەرەکەت مەسکەنی صەد ساڵمە شایەد
جارێ لە دەمی تۆ ببیەم صەگ بەوەفایە
دوور لە تۆ نالی صەگێکە بێوەفا وو هەرزەگۆ
بۆچی بانگی ناکەی ئەم کەلبە کە نانی نانییە
بەکوێری دوور لە تۆ وا مایەوە نالی لە مەی یارەب
فیوضی تۆزی ڕێگەت کوحلی چاوی ئینتیظاری بێ

نالی هەروەك خۆی بە دەست شیعری خۆیەوە سەرگەردان حاڵە و دەمنـادەم لەبارێکـەوە دەچـێتە بـارێکیتر، ئـەدیب و شـیعر دۆسـتی کـوردیش پێیـەوە خـەریك و دامـاون، تـا لـە بـەحری غـەزەلێکی دەپەڕنـەوە بـە دوای بـەیتێکی تریـەوە دەگیرسـێن، هێـشتان لـەمیان ڕەهـا نـەبوون دەکەونـە قورتی تەپکەییێکی تری، حاڵیش پـی ناچـێ حەسانەوەی ئەدیبان لە قۆرت و داو و گێژەنی ئەو شیعرانە بەڵێنی دوا ڕۆژێکـی نێزیـك بێـت، چـەندین جـار ئـەدیب و شـاعیر سـەر بـەم بەیتەدا دەگرن:

من لە طەوری عالەم و دەوری فەلەك
ضەربی لازب، زەخمی بێمەرهەم دەخۆم

ڕەملانی لێداوێن و دەیخەنە بەر سرنجی ورد و لێکدانەوەی دوور و قووڵ تاکو لە گۆشەییێکی زەینە پڕ دەنگ و صەدداکەی مەشغووڵ بـە نالییـەوە تروسـکەی ئـەم (لـەف و نەشـری مـشوش) یـان بـۆ دەبریسکێتەوە:

طەوری عالەم: دەوری فەلەك
ضەربی لازب: زەخمی بێ بەرهەم

چونکە بە درەنگەوە دەزانرێ (طەور) بە واتای گەبەریش دێت کە لێی دەوەشێتەوە (زەخمی بێمەرهـەم) بخاتـە لەشـەوە، ئیتر کە زەخم بـو بـە هـی (طـەبـەر) دیـارە (ضـەربـی لازب)یـش دەمێنێتـەوە لـە هـەر دەورەیێکی فەلەکەوە بە سەروگوێی نالی بکەوێت.

بـە ڕاسـتی دەمێکـە (نـالی) خـەڵقی بـە خۆیـەوە خـەریك کـردووە: لەوەتەی شیعری گوتوە ئەو پایە دیاریکراوەی مەتانەت و فرەواتایی و گەوهـەرداریی بـۆ خـۆی هـەڵناوە، یـەکێکی وەکـو حـاجی قـادر کـە هاوچـەرخی بەشـی زۆری ژیـانی نالییـە، هەرچـەندە بـاوەڕ ناکـەم دیبێتـی، لـە خـۆوە بـەرەوپیری تەقدیس و پایەلێنانیـەوە دەچێت و دەڵێت:

بە "تەضمین" بەیتێکی نالی دەهێنم تا ڕەفیقانم
بزانن من بە ئەو ناگەم خەزەف قەت وەك گەوهەر نابێ
"کەمەندی زوڵفی دوو لانە لە بۆ گەبر و مسڵمانە"
دەکێشێ بێ محابانە چ لەم لابێ چ لەولابێ"

لـەم سـەردەمەدا کـە سـەردەمی پـشت لـە کەلـەپوور کردنـە، بـە تایبـەتی لـە نێـوان میللـەتی کەساسـی وەك میللـەتی کـورد، گـەنجان وەك پەروانە لە تاریکایی ڕابردوو هەڵدێن بەرەو گەشایی ئەدەب و هونـەری ئەوروپا، نالی قەد قامەتی بەرزی ئەدەبەکەی لـە جەرگـەی صـەدەی نۆزدەمـەوە وەك فـەنار بەسـەر دەریـای صـەدەی بیستەمدا گەردەن کیل دەکات و گەشتی دەریانەوەردانی شیعر و ئەدەب بۆ تیشکە گەشەکەی ڕادەکێشێت. ڕەنگە شتێکی ڕاسـت و دروستمان گوتبێ بەوەدا کـە بڵـێین نـالی لـە هـەموو ئـەدیبانی کـوردی لێـرە بـە پێشەوە پتر زەین و فکر و خامەی نووسـەر و شیعر دۆستی کوردی ئەمڕۆکەی بە خۆیەوە خەریك کردوە و زۆرتر ناو و یادی لە گۆڤار و ڕۆژنامـاندا بەرچاو دەکەوێ. هەر دەڵێی خاسیەتە نەمرەکانی بە پێـی بریـاری یاسـای سروشـت، کـە خۆشـنامەدی لـە هـەموو هێزێکـی خـۆ نوێکەرەوە دەکات، ئەوانیش لەگەڵ کاروانی ژین و ژیـاردا ڕووەو دوا ڕۆژی بێبڕانەوەی نەتەوەی کورد، چیناوچین و پشتاوپشت، ورشـە و

هونەر و ڕەنگ و دەنگ و بێن دەپــژێنن، میهرەگان و بەهارستانی بەردەوام بەرپا دەکەن.

وەك مــن بــۆ شــتان دەچــم و چــاکەو خراپــەی دیاردەکــانی کۆمەڵایەتی و گۆڕان و بەرەوپێشچوون دەدەمە بەر حوکمی واقیع تاقیکردنەوە، دەبینم بەردەوام بوونی حورمەت و ڕێزگرتن لە نرخە میراتیــەکانمان یەکێکــە لــەو دیمەنــە ســازگارانەی کــە هــەنگاوی سەرەژوورمان تێیدا خێراتر دەبێ، چونکە دیارە هەڵبەزینەوە لە بــەرزایی ڕابــردوەوە پــتر تێهەڵدەکێــشێت نــەك لەســەر تــەختایی حازرێکی تازە دەست پێکراوەوە. سەرەڕای ئەم سوودمەندبوونەی بەسەر بەزایی ڕاوەستانەوە، جارێکی تریش لە حورمەتگرتنی ڕابردووی بەنرخمان سوودمەند دەبین بەوەدا کە زەحمەتی بێهودە بە خــەرج نــادەین لــە ڕمانــدنی شــتی بــەنرخمان. دەمــەوێ لێــرەدا میسالێکی مادی بەرچاو بێنمەوە: ئێمە کە بمانەوێ جل‌وبەرگ و پۆشاکمان بەرەو چاکتر بگۆڕین نابێ پۆشاکی لێرە بە پێشەوەمان بسووتێنین، بە ڕووت و قووتی پێوانەی پۆشاکێکی نوێ بدەینە بەر قەلافەتمان چونکە شوبهە نیە لەوەدا کەوا بەشێکی زۆری عەیب و عاری پۆشاکی کۆنمان دووبارە دەبێتەوە لەم کارەی وەها بی بنج و بنگــەدا: خــەریك بــوونی بــێ ســابیقە و پێــشینە وەك وشــکەمەلە و دروێنــەی پــوش و گوشــینی خــۆڵ بــێ بــەر، یــاخود کــەم بــەرە. "برناردشۆ" چەند جوانی فەرموو کە لێیان پرسی "تۆ گەورەتری یاخود "شەکسپیر" ئەویش لەوەرامدا بەوپەڕی باوەڕبەخۆکردنەوە گوتی "ئەو لە من کەڵەگەتترە، بەڵام من لەسەر شانی ئەو ڕاوەستاوم ئەدیب و شاعیرێکی کوردیش چەند بەرز دەبێتەوە کە لەسەر شانی "نــالی" و ئاوەڵەکانیــەوە گەشــتی بــەرەژوور دەســت پــێ بکــات. تــا ئیمکانی دەبێ سەکۆیەك بە بڵندایی قامەتی "نالی" لە نۆژەنەوە بۆ ڕوانگەی ئەدیبێکی کورد دروست بکرێ، ئەوەندە کات تێ دەپەڕێ کە سەکۆکە لە نۆژەنی بکەوێ و دەوری بەسەر بچێ، وەك کە هەندێك "نوێخواز"دەڵێن دەوری نالی بەسەر چوە.

ئەدیبێکی کورد کە ڕازی نەبێ بەسەر شانی نالی و کوردیی و جــەلی و شــێخ ڕەزاوە ڕاوەســتێ، دیــارە چــاوی بڕیوەتــە ئەســتۆی ئەدیبی نەوباوی غەیری کوردەوە کە کاولە هێلانەی بەسەرەوە بکات و لــەوێوە بــاڵ بگرێــت. مــن ئەوەنــدە خــۆ تــەفرەدەر نــیم بڵــێم ئەمــە کارێکی ناموم‌کینە چونکە چاوم بایی دیتنی واقیع کراوەتەوە و دوو جاران مومکین بوونی ئەم کارەی دیتووە:

جارێکیان لەوەدا کەوا بەڕاستی ئەدەبی کورد و غەیری کورد هەیە و بووە پێوەندی مەعنەویی خۆی بە ئەدەبی نژادەکەیەوە بڕیوە و وردە ڕەگی لەسەر بنجی ئەدەبی میللەتێکی تر داکوتاوە، تەنها شــێوەییێکی بەرچــاو لــە میراتــی ڕابردوەکەیــەوە پەڕیبێتــەوە بــۆ ئەدەبەکەی، زمانی مادەرزادی بوەو بەس. ئەمە جارێکیان.

جارێکی تریشیان لەوەدا ئەگەر یەکێك میراتی مروانی خۆی بەلاوە ناچاری ناچارە دەبێ میراتێکی بێگانە بخوازێتەوە دەنا لە برسان دەمرێ، لەوە گەڕێ کە ڕۆشتن و فڕینی پێ ناکرێ.

ئەدیبی کورد و غەیری کوردیش دەبێ بزانن کە ئەگەر لە زمانی فریــشتەکانەوە دەنگوباســی بەهەشــتمان بــۆ بکــەن بــە هەڵبەســت و پەخشان تێیان دەگەین و نە کەیفیشمان پێیان دێت. چونکە کورد و غــەیری کــورد لــە زمــانی ئــادەمیزاد دەگــەن. تەنانــەت ئــادەمیزادی ئاشناش نەك بێگانە. چاوت لێیە کە پارچە هەڵبەستێکی بێگانە دەکرێتە کوردی چەند ناقۆڵا و نالەبار دێتە بەر هەست و گوێمانەوە؟ هەر میللەتە هەست و هۆش و گۆش و زەوق و نەریت و خۆشی و ناخۆشــیی تایبــەتی خــۆی هەیــە کــە تێیــان دەگــات و زەوقیــان لێ وەردەگرێت و دڵی پێیانەوە دەبزوێت. چاوەنۆڕیشە بەو ئاهەنگە مەفهوومە ئاخاوتنی هونەر و ئەدەبی لەگەڵدا بکرێت. هەرچەندە بگــوترێ ئــەم ڕۆژگــارە ئاخــاوتنی خــۆی هەیــە جــودا لــە ئاخــاوتنی دوێنــێ و پێــرێ، ڕاستی هەر ئەوە دەبێ کە کورد جارێ لە زمانی دوێنــێ و پێــرێ خــۆی پتر حاڵی دەبــێ تــا زمــانی ئــەدەبێکی نــوێی ئەوروبایی.هەروەك جۆرێ ژیانی دەشت ودەریکوردستانی ١٩٧٦ پترلە ژیانی کوردستانی١٨٧٦دەچێ، گیروگرفتەکانیش خزمــی گیروگرفتــی ئەوســەردەمەن، هــەروەها زەوق وحــەزلێکردن وکەیف پێهاتن و ئەدەبدۆستی هونەرویستیشی کە زادەی واقیعێکی نێزیك لەو واقیعەن پتر خزمی مەعنەویاتی ئەوساکەن تا مەعنەویاتی شانزەلێزی ترافالگاری ئەمڕۆکە. دەشێ ئەدیبێکی کورد بلوێ و ببێتە بەچکەییێکی پاریس وەیان ڕۆما وەیا پراگ و بە زمان و زەوقی ئەو شوێنانە بدوێ، گڕوگاڵەکەشی لە ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێباندا چاپ بکرێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بزانێت و بزانین کارێکی دەیکات پێوەندی بە کوردەوە نیە چونکە کورد بە تێکڕایی لەو گڕوگاڵە ناگات، لە فەرزی تەرجومانیش بۆی وەرگێڕێتە سەر کوردی هەر تێیناگات چونکە بابەتەکە و تەصەورەکەو وێنەکە و هەموو ناوەڕۆکەکە نائاشنای کوردن. بەڕاستی و بێ لە گەمە تا ئێستا صەدی نەوەدوپێنجی کوردەواریی دەزانێ لەگەڵ گۆراندا بڵێ:

گوڵ نەبێ بۆ سەرم ئاڵ چەپکێ زەرد چەپکێ
نایەم بۆ زەماوەند نایەم بۆ هەڵپەڕکێ
بەڵام صەدی پێنجی کورد زەوق وەرناگرێ لەوەدا کە بگوترێ:
لە لۆجی بەرانبەر شانۆکەوە...!
بە دووربینی شەوانە...!
کەوا قایشەکانی بەسەر سوارێ قەشەنگەکەتدا دەخولایەوە...!
پێکەوە سرکە و کورکەمان لەگەڵ سەر پەنجەکانی بالێرینا دەکرد...!!؟؟

من لەم گوتەیەمدا هەرگیز نامەوێ دژی سواریێ و بالێ بوەستم وەیا ئاخاوتنە مەنع کەم کە زمانی سواریێ و بالێیە، دە جارانیش لە خاوەنی گوتەی وەها پتر حەز دەکەم کوردەواریی بگا بەو پلەیە کە گەنجەکانی قەلادزە و عەبابەیلێی لە ئاهەنگی شەوانەی بالێوە، قۆڵ لە قۆڵی دڵدارەکانیان وەیا دەزگیرانەکانیان وەیا ئاوەڵەکانیان، بەرەو تالاری کامەرانی سەدەی بیستەم، دمەوبەیان، بە ئوتۆمۆبیلی شیك و شەنگ بگەڕێنەوە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە گەیشتنی گەنجی کورد بەو پلەیە لە ژیانی مادیو مەعنەویی کۆتایی سەدەی بیستەم کە ئەمەش مومکین نابێ ئەگەر پەتی پێوەندیی ئەمڕۆکەی کورد بە پێشکەوتنی ڕاست و دروست لە بەرگ گۆڕیی وەیا خۆگۆڕییدایە نە دەزانن پێشکەوتن چیە نە ئەگەر دواکەوتنیش ڕوی‌دا پەرۆشیان دەبێت، چونکە دیارە کەسێك ڕاستی شتێك نەزانێ پێچەوانەکەشی نازانێ.

لەم قسانەمدا مەبەستم ڕەخنەگرتن لە جۆر و شێوەی دەربڕینی دەروون نیە، هەرچەند باشتر ئەوەیە شێوەش لەوانە بێ بە ئاسانی بێتە ناو تەصورەوە، مەبەستی من (تصور)ی ناو شێواز و ڕوخسارەکەیە خوێندەوارێك بتوانێ خۆی شارەزا بکا لە دەمودووی ئەدیبی نزیك و دوور، هی ئەم ڕۆژگارە و هی هەزار ساڵ پێش ئێستا، وەك ئەوانیش بدوێ وەیا ئەگەر شاعیر بوو شیعر هەڵبەستێ. بەولاتریشەوە دوور کەوێتەوە بەرەو کاوێژکردنەوەی خۆراکی ئەوان. بەڵام ناتوانێ بە خۆی بڵێ ئەدیبی کورد، ئەدەبەکەشی بە ئەدەبی کوردی لە قەڵەم بدات.

لەبەر ئەم لێکدانەوەیەیە کە من زۆر حەز دەکەم ببینم نەوباوی کورد بە خۆی و ڕابردووی میللەتەکەی و ئێستاکەی میللەتەکەیەوە خەریکە، لەم خەریك بوونەشیدا ڕابردوو و ئێستاکە بداتە بەر یەك نیگای سەرلە لەبەر و بێ کەلەبەر کە لێك پچڕانەوە و لێك ترازانی تێدا نەبێت، چونکە بەم جۆرە نەبێ کەسایەتی "کورد" لە بەرهەمی ئەدیبەکانیدا دەرناکەوێ، بەڵکو دەتوانم بڵێم گەورەترین هۆی تێچوونی دروشمو کەسایەتی میللەتەکەمان لەوەدا دەبێ کە ئەو ئەدیبانەی لێیان چاوەڕوان دەکرێ ناو و بوونی کورد بپارێزن، ئەوان وێنەی لاوەکی و خوازرایەوە لە جێگەی وێنەی ڕاست و دروستی دوێنێ و ئەمڕۆمان دانێن. دەبێ بزانین فەرقێکی گەورە هەیە لە نێوان ناسینی میللەتان و لە نێوان خواستنەوەی شێوەیان. کە بمانەوێ لە ئەدەبی ئەڵمان بگەین دەبێ لە ڕێگەی ڕاست و دروستی تێگەیشتنەوە بۆ ئەم ئامانجە بڕۆین نەك ئەوان لە خۆماندا بدۆزینەوە.

هەرچەندە ناسینی میللەتان و شارەزابوون لە ئەدیبان پێویستێکی ڕۆشنبیرییە، بەڵکو شەقڵێکی بەیەکەوەژیانی ئادەمیزادی ئەم ڕۆژگارەیە، دیسانەوە خۆناسین و شارەزا بوون لە ئەدەبی نژاد بەر لە هەموو جۆرە ناسین و شارەزابوونێکەوە دێت.

ڕەنگە بتوانم بە شەکسپیرەوە خەریك بم، هەندێك لە نووسینەکانیشی وەرگێڕمە سەر کوردیی، نەك ئەوەندەو بەس، بەڵکو وەرگێڕانی شاکارەکانی "شەکسپیر" و ئەدیبە زلەکانی میللەتان کارێکی پێویستیشە لە نێوان کاری پێویستدا. بەڵام خەریك بوونی من و تۆ بە خۆمانەوە لە پلەی یەکەمدا دێت. عەرەب دەڵێ: ثبت العرش ثم انقش" ئێمەش دەبێ ڕەگ لە هەناوی خۆمان داکوتین تاکو بژین، بەدوا ژیندا دەست درێژ کەین بۆ میوەی باغی جیرانان. خۆدانەپاڵ بیروباوەڕی ئەوتۆ کورد و غەیری کوردمان وەك یەك بێنێتە بەرچاو، وەیا کورد بخاتە پلەی دووەمەوە، کارێکە وەها بێنرخمان دەکات بە کەڵکی ئەو بیروباوەڕەش نەیەین. بە ڕادەی ڕێز لە خۆنانت دەگرێت، کە دەزانم دۆستی وەها نە هەیە نە دەبێ. ماڵیان ئاوا بێ. هەموو میللەتانی جیهان پڕ بە دەم هاواریانە و لە گوێی میللەتی بێهێز دەزیرێنن و دەڵێن تا ئەو ڕۆژەی حورمەتی خۆتان بە سەرماندا دەسەپێنن ئێمە هەر بەزەییمان پێتاندا دێتەوە، ئەدیبێکی کوردیش هەر ئەو ڕێگەیەی بەرز کردنەوەی ئەدەبی میللەتەکەی لە بەردەمدایە کە بتوانێ حورمەتی میللەتەکەی تێدا بچەسپێنێ. ژیاندنەوەی کەلەپوور یەکێکە لەو شەقامە ڕاست و بێ قۆرتانەی یەکسەر دەمان گەیەنێتە قۆناغی ڕێز و حورمەت. ئەوانەی بە نالی و ئەمسالی نالییەوە خەریکن، بێگومان، لەو ڕاست و ڕەوانەدا بەرەو حورمەتی نژادەکەیانەوە دەڕۆن، منیش شوێن پێی ئەوان هەڵدەگرمەوە لەم نووسینەمدا هەرچەند دەشزانم کەموکەسەر و بەکەلەبەرە.

نالیش وەکو مرۆڤە ناسراوەکانی سەردەمی خۆی کە لە کۆشی هەژاریی و بێ سەروشوونی و بەرچاو نەبوونی ژیانی ڕەشۆکییەوە پلەی مەهارەت و بلیمەتی خۆیاندا سەرەژوور تێهەڵکشان بۆ بەر نیگای بینەران و سرنجی مێژوو، کەمتاکورتێکی پڕ کوێرەوەری و دەردی سەر ناگزووریەوە، خۆڕە خۆڕی دەنگ و ئاوازێکی وەك گاڵ و بوغی نامەفهوم بە جووتە جۆگەلەی گوتەی دەماودەم و هەڵبەستەکانیدا دێتە بەر گوێی حاڵی نەبوونمانەوە کە هەر بایی ئەوەندە دەکات تەرجەمەیەکی پچڕپچڕ و پڕدەمەتەقەی سەلماندن و نەسەلماندنی بخەینە سەر خوانی لێکۆڵینەوەوە.

وا گوتراوە و نووسراوە کە نالی لە ساڵی ١٧٩٧ی زایینی، لە گوندی "خاکوکۆڵ"ی شارەزاووردا پێی ناوەتە ئەم جیهانە. نیسبەتی لەگەڵ "خاکوخۆڵ" جێی گومان لێکردن نیە چونکە لە چەند شوێنێکی دیوانەکەیدا ئەم نیسبەتە مۆری بە ڕاستگێڕانی لەلایەن نالییەوە لێ دراوە:

داخل نەبی بە عەنبەرسارایی "خاکوخۆڵ"
هەتا نەکەی بە خاکی سولەیمانییا عبور
تری عینه الابدان من "خاکوخۆڵ"ه
تری مندالْ الاوراق من تۆزو گردە

بەڵام داخەکەم ئەم تاکە خەبەرە گومان لێ نەکراوە هەر دەڵێی ئەو "اقرار"ەیە کە دەلالەتی بۆ غەیری خۆی لێ وەرناگیرێ. چونکە ئەوەندەی تێی دەفکریت هیچ شتێکی پێ ساغ ناکرێتەوە ببێتە تروسکەی ڕووناکایی کە تاریکی لە دەوروبەری خۆی دەڕەوێنێتەوە.

من ئەمە دەڵێم هەرچەندە لە بەشی یەکەمی "حاجی قادری کۆیی" بایی ڕوونکردنەوەی هەندێ چەندوچۆنی سەرەتاکانی ژیانی "حاجی" دەلالەتێکم لە نیسبەتی نالی بۆ (خاکوخۆڵ) وەرگرتوە کە هاتووم ئەو پێوەندییەم بە پێوەندیی "حاجی" لەگەڵ "گۆڕە قەرەج" گرتوە و بە پێی لێکدانەوەیەکی کە لەو کتێبەدا کراوە گەیشتووم بەو باوەڕە کە نالی قۆناغی منداڵی خۆی لە دەشتودەر بەسەر بردوە بە پێچەوانەی حاجی کە دەبێ لە ساواییەوە فێری ژیانی شار بووبێت. وەك دەبینیت دەلالەت وەرگرتنەکە پتر لایەنێکی ژیانی "حاجی قادر" ڕوون دەکاتەوە تا "نالی" چونکە بە دوا ئیسپاتکردنی فرچك گرتنی نالی لە ژیانی خاکوخۆڵ و دەشت و دەردا ناگەین بە ئیسپاتی هیچ شتێکی تر غەیری ئەو فرچکگرتنە. ئێمە کە ئیسپاتمان کرد نالی سەرەتای ژیانی ساوایی و منداڵی لە گوند ڕابواردوەو بەمەدا زانیمان تاساڵی ١٨٠٧ وەیا ١٨٠٨ وەیا شتێك دواتر پێوەندیی ژیانی بە شارستانەوە نەبووە، نە هیچ خەبەرێکی سەر بە نالییەوە بەم زانینەمان دەچەسپێ نە هیچ خەبەرێك لەو بابەتە هەڵدەوەشێتەوە. بەسترانەوەی سەرەتای ژیانی نالی بە (خاکوخۆڵ) و شوێنی وەك ئەوەوە لەو ڕوداوانەن کە پەنجە بۆ هیچ شتێکی دەرەوەی خۆیان درێژ ناکەن. ئێمە هیچ خەبەرێك و ڕووداوێکمان بە دەستەوە نییە پەکی لەسەر ساغ کردنەوەی چۆنیەتی بەسەرچوونی پلەی ساوایی نالی کەوتبێ تا ئەگەر لە خاکوخۆڵی ڕابواردبێ خەبەرەکە قاڵبێك وەرگرێ غەیری ئەو قاڵبە بێ کە لە ژیانی ناو شارستانی وەردەگرێ. بە کوردیی و بە کورتی ئەم نیسبەتەی نالی وەلای (خاکوخۆڵ) ڕاستییێکی نەزۆکە وەچەی لێ ناکەوێتەوە هەر چەند بە نەزۆکیش قبوڵمانە چونکە هەر نەبێ لە دەردی سەری دۆزینەوەی هەوەڵ مەفتەن و نشیمەنیمان ڕزگار دەکات، لە شکڵ و شێوەی دەوروبەری لێ فراژووبوونیشمان ئاشنا دەکات. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا چاوەڕوانمان دەکرد وێڕای زانینی ئەم ڕاستییە سادە و قوتیلەیە دوو خەبەری سادەو قوتیلەشمان پێ گەییشتبا لە چەندوچۆنی بەسەربردنی ژیانی ڕۆژانە و بێنەوبەرەییێکی کە لەو ژیانەدا دووچاری نالی هاتبێ، وەیا لە چ تەمەنێکەوە "خاکوخۆڵ"ی بەجێهێشت، هەوەڵ جار بۆ کوێ چوو، سەردانی "خاکوخۆڵ"ی دەکردەوە!! من هیچم لەم بارەیەوە نەبیستوە، کە نەمبیستوە نەشم خوێندۆتەوە. بە هەمە حاڵ وا پێ دەچێ ئێمەمانانی لە دوورەوە گوێبیستی دەنگ و صەدای نالی دەبین ڕێمان نەبوە وردە هەواڵی ئەم چەندو چۆنییە بکەوێتە بەر گوێمانەوە، دەمێنێتەوە خەڵقی شارەزوور و ئەو شوێنانەی لەوێ نزیکن سرکەوکورکەییێکی لێ بزانن. ئەگەر کەس لەوان هەیە شتێك بزانێ، زۆر یان کەم، مافی کوردەوارییی لێی داوا دەکات ئەو شتە بە نالیدۆستان ڕابگەیەنێ. ئەمە دەڵێم باوەڕی پێ دەکەم، بەڵام بەتەمای هیچ ئەنجامێکیش نیم.

وەك دڵنیاین لە نیسبەتی نالی بۆ "خاکوخۆڵ" هەرچی هۆی دڵنیایی هەیە بە دەستمانەوە نیە لەو ساڵە ناو دەرکردوەی ١٧٩٧ کە ساڵی بە وەلەد بوونی نالی بێت. هەروەك دەستەوەستانین بەرانبەر ئەم ساڵە، دەستەوەستانیش دەبووین بەرانبەر ساڵێکی تری وەك ١٧٩٠ وەیا ١٨٠٥ وەیا هەر ساڵێکی تری خزم بەمان. ئەوەی دەڵێ نالی لە ١٧٩٧ هاتۆتە دونیا هەرئەوەندە بەڵگەیەی بە دەستەوە هەیە کە بە دەست یەکێکی ترەوە هەیە بڵێ لە ١٨٠٤ وەیا ١٧٩٥ وەیا ١٧٩٣ وەیا یەکێکی تری وەك ئەمان بەوەلەد بوە. هیچ یەکێك لەو ساڵانە بایی فلسێك لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا نەکراوە، هیچ یەکێکیشیان نە بەڵگەی ئیسپاتی هەیە نە بەڵگەی بە درۆخستنەوە. تا ئێستا هیچ لایەنێکی ژیان و بەسەرهاتی ساغ نەکراوەتەوە کە لە تەرازووی مەنتقیدا لەگەڵ یەکێك لەو ساڵانە خۆش هەڵستێتەوە و بە یەکێکی تر ناسەرسەنگ بێت. ئەگەر گوترا لە ١٧٩٧ هاتۆتە دونیا کام بەسەرهاتی نالی وەیا هی غەیری نالی کە پێوەندیی بەوەوە هەیە پتر جێی خۆی دەکاتەوە لە لیستەی زەمەنی ئەو ڕووداو و مێژوانەی لێیان دڵنیاین؟ ئەگەر ١٩٧٩ەکەمان کرد بە ١٧٩٠ کام ڕیسی لێکدانەوەمان دەبێتەوە خوریی؟ چەند حیسابمان لێ هەڵدەوەشێتەوە؟ هیچ هەر بە جارێ هیچ. ئەوەندەی بێتە بەر حیسابانەوە هەر ئەوەیە کە نالی دەبێ لە کاتی پاشایەتی "سلێمان پاشا"دا ئەو عومرەی هەبووبێت کە توانیبێتی بڵێ:

هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین
خۆی کە دامەنگیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا

چونکە، وەك دواتریش باس دەکرێتەوە، "شاهی ئاصەفی ثانی" شەخسی "سلێمان پاشای بابان" دەستنیشان دەکات. ئەگەر سەروسۆراغەکی بەڕێوجێی "مەستورە"مان بە دەستەوە با ئەویش لەلای خۆیەوە بێهێزیی وەیا بەهێزیی ئیحتیمالی ساڵەکەی ١٧٩٧ی ڕادەگەیاند لەو ڕووەوە کە دەبێ نالی لە ساڵی بەوەلەد بوونیەوە تا کاتی هەڵبەستی قەصیدەکەی مەستورە ئەو عومرەی هەبووبێ شتی وا بەهێز و پڕ جورئەت بڵێ. زانینی مێژووی ژیانی مەستوورە دەخلێکی تەرجیح وەیا گومانـاویکردنی ساڵەکەی ١٧٩٧ی لێ دەفامرێتەوە، بە تایبەتی کە دەزانین هەندێك لە بەیتەکانی ئەو قەصیدە بێپەردەیە وا ڕادەگەیەنن لە کاتی هەڵبەستنیاندا هێشتا مەستوورە شووی نەکردبێ، وەك کە دەڵێ:

ئەم نوكتە چیە میسلی سوها بێ نەسوابێ
دوڕڕەی وەكو دوڕڕێكی سەما بێ نەسمابێ
وەیا كە دەڵێ:
دەعوای ئومەرا چەندی لەسەر تەختی كرابێ
چەند خوێنی ڕژابێت و چ خوێنی نەڕژا بێ (١)

خوێنی یەكەم هی عوزری مانگانەی ئافرەتە، خوێنی دوەم هی كچێنییە. ئەگەر ئەم بۆچوونەم ڕاست نەبێ بە ماندووبوونێكی زۆر نەبێ واتای بەیتەكان ناچنە ناو قاڵبی مەفهوومەوە. بە هەمە حاڵ ئەمە بۆ خۆی مەبەستی قسەكانم نییە.

دیوانەكانی نالی و نووسەرانی كورد كە دێن باسی نالی دەكەن، تێكڕایان ئەم ساڵەی بەوەلەد بوونی نالی لە غەیبەوە دێنن وەك كە ڕاستییەكی بێ دەمەتەقەیان لە دەفتەرخانەی مێژووی ساغ كرایەوە دەرهێنابێ. تەنانەت كە یەكێك ساڵێكی غەیری ئەم ساڵەی ١٧٩٧ە گلێر بكاتەوە سەر خوانی نووسینەوە پێمان ناڵێ ساڵەكەی لە كوێوە هێنا، بۆچی ئەمیانی پەسەند كرد، ئەوی تریان لە كوێوە درۆی دەركەوت، بۆچی یەكێكی تر دەست نادا؟ واز لە نووسەر بێنن كە حەز دەكات بە (٥) دەقیقە لە هەموو باسوخواسی ناو نووسینەكەی بێتەوە و هەناسەی حەسانەوە بە دیار بەرهەمە خنجیلانەكەیەوە هەڵێنێ، ئەدی خوێنەر؟ بۆ دەنگێك ناكات؟ ڕەخنەیێك ناگرێت؟ ناپرسێتەوە؟ بە درۆ ناخاتەوە؟ بەڕاستی دیمەنێكی سەیرە ئەم دیمەنەی بێ بەڵگە لە نووسەرەوەو بە (خوای ڕاستت فەرموو) لە خوێنەرەوە. ئەگەر بەر لە ٥٠ ساڵ شتی وەها سەیر نەبووبێ، بێگومان ئەمڕۆ لە سەیر سەیرترە. من پتر لەوە دەڕەنجێم كە نووسەر لە دوو لێوەیەوە دەرنایێ بڵێ ساڵەكەم لە كوێ بە دەست كەوتوە. نەك كە بێدەنگە لە ساغ كردنەوەی ساڵە پەسەندكراوەكەی خۆی وەیا بە درۆخستنەوەی ساڵی پەسەندكراوی نووسەرێكی تر.

بەسەر ساڵی هاتنە دونیایدا باز دەدەین بۆ ساڵەكانی تری وەك چوونە حەجی و نیشتەجێ بوونی لە شام و چوونی بۆ ئەستەنبول و كۆچی دواجاری، دەبینین ئەمانەش سەرلەبەریان وەك قەپووچكەی ئاو بێ بنج و بناوانن، كەم و زۆر بەڵگەیەكیان نییە بەقەدەر ڕیشاڵە كورتیلەی قەوزەی سەراویش بە بنگەییێكیانەوە بلكێنێ، هەندێكیشیان لەوانە نین بە قەپوچكەشیان تەشبیه بكەین وەیا بە قەوزەیان بگرین چونكە قسەی سەرەوبنن ئەگەر چ ڕەگیان هەبا بە بۆشاییەوەی دەبەستنەوە وەك ئەوەی كە لە پێشەكی هەندێ دیوانەكانی نالی نووسراوە كە وا لە ساڵی ١٢٥٥ی كۆچی دەچێتە ئەستەمبوڵ و لەگەڵ ئەحمەد پاشادا ڕادەبوێرێ لە حاڵێكدا ئەحمەد پاشا تا ساڵی ١٢٦١ هەر حاكمی بابان بووە...

ئەگەر چی دوان و ڕەخنەگرتن لە بارەی هاتنە دونیایەوە هەر لەسەر بنكەی بێ بەڵگەیی ئەو ساڵەوە هەڵدەستێت و چیمان بە دەستەوە نیە بیكەین بە بەڵگەی تەرجیحی ساڵێكی تر، بەڵام لە بارەی ساڵی مەرگییەوە ئەو دەستبەتاڵە و بێ كەرەستەی ڕەخنەگرتن نین، بە پێچەوانە بەڵگەی زۆر مەحكەم و دروستمان بە دەستەوەیە كە ساڵەكەی بە تەواوی هەڵدەوەشێنێتەوە. لێرەدا كە من بە دەم نووسینی پێشەكی ڕیزەگوتارەوە خەریكی دەمەتەقەیێك بم لەسەر هەندێ باری ژیان و بەسەرهات و مەرگی نالی، لە كورتەیەكی لێكدانەوەی دووردرێژ و سەرەتاییێكی توێژینەوەی بەهێزوپێز بەولاوە دەرفەتی نووسین و خەریك بوونم لەبەر دەستدا نیە. سەرەڕای نەبوونی دەرفەت، كارەكە خۆی بەبەریەكەوە نیە كتێبێكی لێكۆڵینەوە بكەم بە پێشەكی چەند گوتارێك. لەمانەش بترازێن هۆی تایبەتی هەیە لێم داوا دەكات خێرایی بكەم لە كۆتایی هێنان بەم نووسینە، هۆیەكەش دەگەڕێتەوە بۆ چەندوچۆنی باری چاپخانەی كۆڕ كە مەكینەییێك عومری بەسەر دەچێت و دەبێ لە ئەركە كۆنەكانی ببێتەوە بەر لە بڕانی دوا هەناسەی ... ئەم نووسینەش بەردەوام بوونی ئەركێكی كۆنیەتی و دەبێ خێرا ئەنجام بدرێت.

بە پێی لێكۆڵینەوە و وردبوونەوەی خۆم ئەوەی بۆم ڕوون بۆتەوە لە بارەی ساڵی مەرگی نالی، شتێكە تا بڵێی جودایە لەوەی بەسەر زارانەوەیە، وەك من دەزانم و بەڵگەی بەهێزیشم بەدەستەوەیە نالی ١٥ ساڵ زیاتر ژیاوە پاش ئەو ساڵەی ١٨٥٥ كە شۆرەتی بەستوە بە ساڵی مەرگی، لە میانەی تەحقیقی ئەو ساڵەدا گەلێك لێكدانەوەی كورت و مامناوەنجی لە بارەی چەند ناواخن و ناوەڕۆكی ژیانی نالی هەیە پاش دەرچوونی لە سلێمانی، دەبێ، بەوپەڕی كورتبێژییەوە لێی ببینەوە هەمووشیان بە بەریانەوە هەیە بكرێن بە ماكی دیراسەی درێژەدار. پێ بە پێی ئەم گەشتە كورتیلەیەی ناو پێشەكی، بەو ناوەڕۆك و ناواخنانەدا تێدەپەڕین.

نالی لە ساڵی ١٨٥٥دا نەمردووە. تەمەنیشی لە كاتی مەرگیدا ٥٨ ساڵ پتر بووە، ئەمەش ئەنجامێكە لەوەوە وەردەگیرێت كە لە پاش ١٨٥٥ مردووە نەك كە لە پێش ١٧٩٧ دا هاتبێتە دونیا.

تا ئێستا قسەیەك لەم بابەتەوە بە لێكۆڵینەوە بژمێررێت و بڵاوكرابێتەوە هەر ئەوەیە لە نووسینەكانی مامۆستا عەلائەدین سەجادی، بە تایبەتی پاشەكی كتێبەكەی "وورد بوونەوەیەك لە دوو چامەكەی نالی و سالم"دا دەدیترێت. من نەم كردووە بە عادەت لە نووسیندا هەر جارە گوتەییێكی خۆم بە گوتەی نووسەرێكی تر بگرم، بەڵام ئەم جارە نەختێك لا دەدەم لەو خووەی كە لێم بووە بە شوون،

خوێنەریش کە ئارەزووی موقارەنەی کرد دەتوانێ ئەم بیروباوەڕە و لێکدانەوەی ئێرە بە نووسینی تر بگرێت و ڕایەکی لێ هەڵێنجێ... بەڵام بۆ مەبەستی کورت کردنەوەی ڕێگای دور لەبەر هەنگاوی خوێنەردا وا لێرە ئەو مێژووانە دەنووسمەوە کە لە کتێبەکەی مامۆستا عەلائەدیندا باس کراون و پێوەندییان بە بابەتی لێکۆڵینەوەی ئێرەوە هەیە:

| مێژوو | ڕووداو |
|---|---|
| ١٧٩٧ | ساڵی هاتنە دنیای نالی. (ل:٤) |
| ١٨١٢ | ساڵی گەشانەوەی بوێژی نالی. (ل:١٢٧) |
| ١٨٣٠ | ساڵی چوونی نالی بۆ حەج. (ل:١٣١) |
| ١٨٣٤ | ساڵی نامە ناردنی لە شامەوە؟ قوربانی تۆزی ڕێگەتم (ل:١٣١) |
| ١٨٣٥ | ساڵی چوونی بۆ ئەستەمبول. (ل:١٣٢) |
| ١٨٥٠ | برانەوەی حوکمداری بابان و کۆتایی حوکمی ئەحمەد پاشا. (ل:١٣٥) |

هەروەك گوتم ساڵی ١٧٩٧ی زایینی لە هیچ لایەکەوە بەڵگە و ئیسپاتی نەبیستراوە. قسەیەکە

گوتراوە بێ ئەوەی بزانین لە چ سەرچاوەیەکیشەوە هەڵقوڵیوە، ڕەنگە ڕاست بێ و ڕەنگە فڕی بەسەر ڕاستییەوە نەبێ. بەڵام کەی چووە بۆ حەج، وەیاخود کەی ئەڵوەدای یەکجاری لە سلێمانی و کوردستانی عێراق کرد، ئەمەیان پرسیارێکە لێکدانەوەی بەڕێوجێ هەڵدەگرێ.

دیوانەکەی نالی دوو موناسەبەی ئاشکرا و یەکێکی مەیلەو شاراوەی تێدایە کە هەر جارە بە شێوەیەك باسی پاشاکانی بابانی تێدا کردووە، ئەوەی شاراوەیە لەم بەیتەدا دەردەکەوێت (لێرەدا بە پێشەوە لە شوێنی تر و نووسینی تردا بەپێی پێویست باسم کردووە):

هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین

خۆی کە دامەنگیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا

ئەم "شاهی ئاصەفی ثانی" زۆر بە ئاشکرایی دیارە کە "سلێمان پاشای بابان"ە چونکە لە ڕادەی بەدیهیەدایە کە "شاهی ئاصەفی یەکەم" سلێمان پێغەمبەرە کە لە هەمان کاتدا شاهیش بووە، چ قسەی ناوێ مومکین نیە کەسێکی تر غەیری "سلێمان پاشای بابان" ئەو شاهی ئاصەفی دوەمە بێ و نالی دامەنگیری بێت.

موناسەبەیەکی ئاشکرا قەصیدەکەی "ئەم تاقمە مومتازە"یە کە وا بێگومان وەسفی حەرەسی تایبەتی یەکێك لە دوو پاشای بابانی پێ دەکات: یا سلێمان پاشا، یا ئەحمەد پاشا چونکە پێوەندیی دۆستایەتی نالی بە پاشاکانی بابانەوە کە لە هەڵبەستی خۆیدا دیار دەکەوێت تەنها بەم دوو کەسەوە بوە هەر تازە دیتمان دامەنگیری سلێمان پاشا بوو، ئێستاش جارێکی تر دەبینینەوە مەرسیە بۆ ئەو و پیرۆزبایی بۆ ئەحمەد پاشای کوڕی دادەنێت لە قەصیدە مەشهوورەکەی:

تا فەلەك دەورەی نەدا صەد کەوکەبی ئاوا نەبوو

کەوکەبەی میهری موبارەك طالعی پەیدا نەبوو

پێی ناوێ من بڵێم ، لە خۆوە دیارە ئەم قەصیدەیە دوای بەیتەکەی "شاهی ثانی" هۆنراوەتەوە، کەواتە دیارە ئەمیان شایەدیی مانەوەی نالی لە سلێمانی پتر پێیە. خۆشبەختانە، قەصیدەکە لە کۆتاییدا بە گوتەی "تاریخ جم" مێژووی خۆی ڕوون کردۆتەوە کە ١٢٥٤ دەگرێتەوە. ئەم ساڵەی ١٢٥٤ دەکەوێتە بەرانبەر "١٨٣٨–١٨٣٩"ی زایینی "المورد– المجلد الثالث– العدد الرابع ١٩٧٤–الصفحه ١٣٢" کە ئەمە ٨–٩ ساڵ دەکەوێتە دوای ساڵی ١٨٣٠ی لێرە بە پێشەوە باسکراو. نابێ چ گومان لەوەدا هەبێ کە نالی ئەم هەڵبەستە و ئەوانی تریشی هەر لە سلێمانی داناون نەك لە هەندەرانەوە بۆ سلێمانی ڕەوانە کردبێ چونکە مەنتیق و داخوازیی ڕووداو وا دەکات نالی بەرەو حزوور پێدا هەڵگوتن و پرسەی کردبێ مەگەر بەڵگەیەکی قەطعی پەیدا بێت و پێچەوانەی ئەمەمان بۆ ئیسپات کات. تۆ سەیری دەمودووی ئەم بەیتە بکە:

قصە بێ پەردە و کینایەت خۆشە شاهی من کەوا

عادڵێ بوو قەت عەدیلی ئەو لە دونیادا نەبوو

چەند جوان دیارە شاعیر وتوویژی بەرەوڕووی مردوو و زیندووە، سەرەڕای ئەوە کە تاکە و شەیێك لە هیچ بەیتێکی قەصیدەکەدانیە بە وەهم و خەیاڵیش دووربوونی نالی لە سلێمانی ڕابگەیەنێت. بەڵێ موستەحیل نیە خەڵق لە دوورەوە پرسە بنێرن و لە پرسەشدا باسی دووربوونی خۆیان نەکەن، بەڵام موستەحیل نەبوون بەشی ئەوە ناکات، بێ هیچ بەڵگە ڕاگەیاندنی حاڵ بەدرۆ بخاتەوە، وەك گوتم ئەم مێژووی ١٢٥٤–١٨٣٨، ساڵی چوونە حەجی نالی لە ١٨٣٠ەوە تەواوێك ڕادەگوێزێ، هەر نەبێ ٨–٩ ساڵێك، لە حاڵێکدا سوور بین لەسەر ئەم ساڵەی ١٨٣٠یە کە هیچ بەڵگەیەکیشمان بە دەستەوە نیە بۆ سوور بوون لەسەری، دەبێ خۆمان ئیقناع بەوەی نالی لە حەج گەڕایەوە و حازری مەرگی سلێمان پاشا بوو، کە ئەمەشیان ڕایەکە لە هەواوە دەیقۆزینەوە. چونیشی بۆ

ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٨٣٥ ئەویش لە خۆوە دەسڕێتەوە چونکە دەکەوێتە پێش ساڵی مەرگی سلێمان پاشا و (تاریخ جم). بەڵگەیەکی تری بێ دەمەتەقەی ئەو سڕانەوەیە لەوەشدایە کە (ئا. خۆدزکو) لە گوتارێکی خۆیدا کە لە ساڵی ١٨٥٧ لە (گۆڤاری ئاسیا) دا بڵاوکراوەتەوە دەڵێ ئەحمەدخان لە پاریس ساڵی ١٨٥٣ پێی ڕاگەیاندووە کە نالی لە شام دەژیت (دێینەوە سەر باسی ئەم گوتارە). کەواتە نالی نە ساڵی ١٨٣٤ لە شامەوە نامەی ناردووە بۆ سلێمانی، نە لە ١٨٣٥یش چووە بۆ ئەستەمبوڵ. کە ئەمانە وابن، گومانیش نییە لەوەها بوونیان، ساڵی ١٨٣٠ کەڵکی ئەوەی پێوە نامێنێ ساڵی چوونە حەجی نالی بێت، چونکە لە تاکە حاڵێکدا دەشیا لەو ساڵەدا چووبێتە حەج، ئەویش ئەگەر ڕاست با لە ١٨٣٤ نامەی لە شامەوە بۆ سلێمانی ناردبێ چونکە نالی لە چەند ساڵێکان پتر پێی ناکرێ بە دیار ئومێدێکی گەڕانەوە بە شامەوە بگیرسێتەوە، کەچی دەزانین، بە شایەدی "ئا. خۆدزکو" ٢٣ ساڵان دوای ١٨٣٠ ئەو لە شام بووە، بە ڕاستی ئەم گوتارەی "ئا. خۆدزکو" گەلێك یارمەتی ڕەواندنەوەی نادیاری ئەوان ساڵانەی ژیانی نالیمان دەدات و زۆر هەڵەمان بۆ چاك دەکاتەوە.

با بزانین لەبەر ڕۆشنایی ڕاستی بێفێڵ و مێژووی بێدەمەتەقەدا کام ئیحتیمال لەگەڵ لێکدانەوەی بە بنج و بناواندا ڕێکتر دێت: ئەمانەی خوارەوە ڕوداو و مێژووی ژووررووی گومانن:

لە ١٢٥٤ (١٨٣٨-١٨٣٩) سلێمان پاشا دەمرێ و ئەحمەد پاشا دێتە جێگەی.

لە ١٢٦١ (١٨٤٥-١٨٤٦) ئەحمەد پاشا لە حوکمداری دەکەوێ. عبدولباقی العمری لەم مصرەعەدا شکانی ئەحمەد پاشا بە دەست نەجیب پاشای والی بەغداوە بە حیسابی جومەل (لە فەرهەنگی (المجند) دا وشەکە (جُمَل) نووسراوە) دەردێنێت: (بسدید رایك فتحت بابانها).

لە ١٢٦٩-١٢٧٠ (١٨٥٣ بەشایەتی "ئا. خۆدزکو") نالی لە شام بووە، هەر لەمەوە دەردەکەوێ ئەو لەو ساڵەدا نامەی نووسیوە بۆ سالم و سالمیش وەرامی بە عینوانی شام بۆ ڕەوان کردۆتەوە.

هەر لێکدانەوەیەك لەگەڵ ئەم ڕاستیانەدا نەگونجێت ناشێ ببێتە سەرچاوەی لێهەڵێنجان چونکە دیارە تەفرەمان دەدات. هەتا خەریك بین بنگەیەکی لێکۆڵینەوە بدۆزینەوە بێگومانتر لەو سێ مێژووە و دەلالەتەکانی، ناگەین بە هیچ ئامانجێك، تۆبڵێ چیمان دەوێ پتر جێی قەناعەت بێ لەوەی کە سالم لە هەڵبەستی خۆیدا بڵێ نامەم بۆ ملّکی شامە و سووی نالییە، ئا. خۆدزکوش پێمان ڕادەگەیەنێ نالی لە ١٨٥٣ لە شام بووە، ئەم مێژووەش بکەوێتە دوای تێکچوونی حاکمیەتی بابانەکان؟ چەند شایەدمان پێ دەوێ بۆ ئیسپات کردنی شتێك، لە دو شایەد پتر، کە بە نووسین نەك بە قسە، یەك شت ئیسپات بکەن؟ شتەکەش وەها ئیسپات بکەن کە بە عەقڵەوە بنووسێت؟

نالی لە ١٢٥٤ پرسە و پیرۆزبایی پێشکەش بە ئەحمەد پاشا کردووە. دواتر چوە بۆ حەج، بە نیازی شوێنێکی تر سلێمانی تەرك کردووە. ئەمە دەڵێم چونکە شیعری نالی بە فارسی گەیشتۆتە دەستمان وا ڕادەگەیەنێ نیازی چوونی بۆ "مصر" هەبووە بەڵام نازانرێ لە سلێمانیەوە ئەم نیازەی بووە یاخود دوای لێ دەرچوونی بە دڵیدا هاتووە بڕوا بۆ مصر:

سوی مصرست مرا راه ازاین لجه غم
تاکه در نیل کشم جامه زبیداد و ستم
میرود نالی از اینجا چو بخیل از دنیا
بالب خشك و کف خالی و چشم پرنم

من دڵم بۆ ئەوە دەڕوا کە نالی بەر لە کۆتایی هاتنی حاکمیەتی بابان دەرچووبێ، واش دەزانم بۆ حەج چووبێ، هێشتا لە حەج نەگەڕابێتەوە شکستەکەی ئەحمەد پاشا بە دەست نەجیب پاشاوە لە ساڵی ١٢٦١ ڕووی دابێ. ئەم بۆچوونەم لەوەوە دێت کە ئەگەر دوای شکستی ئەحمەد پاشا عێراقی تەرك کردبێت، تەرك کردنەکەی دەبێتە خۆڕزگارکردن. دەشزانین نالی لە بارێکدا نەبووە مەجبوری هەڵاتن بێت، چونکە چ دەسەڵاتێکی دنیایی بە دەستەوە نەبووە ناچاری دوورکەوتنەوەی بکات لە ترسی سزاو و تۆڵەسەندنەوە. خۆ ئەگەر بە شعورێکی گوماناوییەوە بۆی دەرچووبێت نایەت دوای چەند ساڵێ دەربەدەری پرسی مەصلەحەتی گەڕانەوەی بۆ سلێمانی بە سالم بکات کە سالم خۆی خۆشەویست نەبووە لای تورکی عوسمانلی. ئەوەی لە هەموو ئیحتیمالات پتر جێی قەناعەتە ئەوەیە نالی پێش کۆتایی حوکمی بابان چۆتە دەرەوەی عێراق. (بە پێی باوەڕی من بۆ حەج)، هەر لەو سەفەرەدا بووە شکستەکەی ئەحمەد پاشا ڕووی داوە کە ئەمە بۆتە هۆی دوودڵی کردنی نالی لە گەڕانەوە. دوو دڵیەکەشی دوو بنجی بەرهەستی هەیە:

یەکەمیان ئەوەیە گۆڕانی باری سیاسی سلێمانی لەوانەیە ببێتە هۆی خۆ وەخراندنی کەسێك کە چ بەرژەوەندی مادی ئەوتۆی نەبێ خێرا ڕایکێشێتەوە بۆ جێگەی خۆی. دووەمیان ئەوەیە نالی پایەیەکی حورمەتی هەبوو لای سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشا، دیارە کە ناحەزی ئەوان بوو بە جێگیری دەسەڵاتیان ڕاستەوخۆ باری حورمەت و بێ حورمەتیش دەگۆڕێ، بۆیە نالی چەند ساڵان بە دیار ئەم گۆڕانەوە خۆی گل دایەوە لە گەڕانەوە تاکو: "سووتا ڕەواقی خانەیی صەبری دڵ و دەروون" و چی تر خۆی پێ نەگیرا و کەوتە پەلەی گەڕانەوە. گڕ و سۆزی ناو نامەکەی سالم لەوانە نییە گومانی

دەسکردی و ساختەیی و خۆنیشاندانی لێ بکرێ. نالی بەڕاستی ئاگری غەریبی لە هەناویدا گڕی بەستووە ئەوجار نامەکەی ناردووە کە دەڵێی دەستەچیلەیە و بۆکز لە جەرگی هەڵدەستێنێ. دیارە بێکەسی و بێماڵی (دواتر باسی ژن نەهێنانی دەکەین) و بێسامانی و بێئیشی ئەمانە هەموویان یاریدەدەری سەرکردنی سۆزو بێئۆقرەیی نالی بوون بە دەست غەریبییەوە. ئەگەر تیجارەتێکی سوودبەخش وەیا مزگەوتو مەدرەسەییێکی قەڵەباڵغ وەیا ماڵوحاڵێکی بەهاتوباتی هەبوایە، دڵی پێی تەسکین دەبوو و نەدەتلایەوە بۆ (بەردی سەرشەقام".

کەواتە بە پێی لێکدانەوەی من کە داخوازی حاڵیش وا ڕادەگەیەنێ نالی لە نێوان ساڵی ١٢٥٤ کە مەرگی سلێمان پاشای تێدا بوەو ساڵی ١٢٦١ کە حوکمی بابان بەسەرچووە، ڕۆیشتووە بۆ حەج. ئیتر بەر لەوە توانیبێتی بگەڕێتەوە کارەساتی نەمانی حوکمی ڕوویداوە. هەر بەم لێکدانەوەیەم وا دەزانم چوونەکەی نالی بۆ حەج دەبێ بایی خایاندنی یەك جار حەجکردن پێش ڕووداوەکەی ١٢٦١ بووبێت چونکە ئەگەر نالی چەند ساڵێك پێش ڕووداوەکە چووبایە حەج، دوای بەسەرچوونی حەجەکە گورج دەگەڕایەوە بۆ سلێمانی. وا دیارە هەر لە سەروبەری خەریك بوون بە حەجەکەوە قەدەر لە کارسازی میرایەتی بابان بۆتەوەو ڕێی گەڕانەوەی نالی بۆ سلێمانی بەستووە.

هەرچەند لە لێکدانەوەی ڕووت بەولاوە چ بەڵگەیەکی مادی بێدەمەتەقەمان لا نییە ئەم بۆچوونەی من بسەلمێنێ، بەڵام بۆچوونەکە زۆر ڕێك دێت لەگەڵ مەنتیقی ڕووداوەکان و ئەو مێژوانەی گومانیان تێدا نیە. بە نمونە دەڵێم ئەگەر نالی سەفەرەکەی ماوەیەکی ئەوتۆ کەوتبا پێش ڕووداوەکەی ١٢٦١ کە بایی چوون و هاتنەوەی کردبا، لەم حاڵەدا وەخرانی لە هاتنەوە ئەو دەلالەتەی لێ وەردەگیرا کە وەزعی ئەو نیسبەت بە حاکمانی بابان ئەوەندە بەرەو دۆستایەتی و ئاشنایی نەبووە کە داخوازی خێرا گەڕانەوەی بکات لە سەفەری حەج، کە نیسبەتی وەها نێزیکیش لە بەیندا نەبێ لزوم نامێنێ نالی دوودڵی بکا لە گەڕانەوە. پێویست بەوەش ناکا دواتر کاغەزی پرس و ڕا بۆ سالم بنێرێ. حاجییەکە و بۆ حەج چووە و دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی وەك چەندین خەڵقی تر کە حەج دەکەن و لە کەسیش ناپرسن ئەرێ بێینەوە یا نەیەینەوە!

تا ئێرە من چ گرفێك لە کارەکەدا نابینم چونکە زۆر جێی خۆیەتی شتەکان بەو جۆرە ڕوویان دابێت کە باسم کرد، بەڵام گرفت لە قۆناغی دوای ١٨٥٣ پەیدا دەبێ کە دەزانین نالی لەو ساڵەدا لە شام بووە و نامەی بۆ سالم نووسیوە پرسی گەڕانەوەی پێ دەکا. بەڵێ! سالم نەومیدی کرد لە گەڕانەوە، نالیش حورمەتی پرس کردنەکەی خۆی و وەرامەکەی سالمی گرت و نەگەڕایەوە بۆ سلێمانی، باشە چی کرد؟ ئایا هەر لە شام مایەوە؟ یاخود ڕایگوێست بۆ شوێنێکی تر؟ ئەم جێگەیە کوێیە؟ ئایا یەکسەر چوو بۆ ئەستەمبوڵ؟ فکری چوونی مصر کەوتە کەللەوە و پێی نەکرا بچێت؟ گەڕایەوە بۆ حەجێکی تر؟ لێرەدا زیهن تەنها یەك ڕێگەی لە پێشدا نیە کە هەر لەوێوە هەنگاوەکانی تۆژینەوەکانی ببات سەر ئەنجامێکی گونجاو لەگەڵ زنجیرەی ڕووداو و مێژووی بێ گومان. لەم هەڵوەستەدا خۆمان بەسەر دووڕییانەوە دەبینینەوە کە ناتوانین بڵێین ئەمەیان "ڕێی هاتە، ئەوی تریان ڕێی هات و نەهاتە".

با جارێکی تریش چاوێك بە مێژووواندا بگێڕینەوە:

لە ١٢٦١ ئەحمەد پاشا لێی تێکچوو و پاشایەتی دۆڕاند.

لە ١٢٦٩-١٢٧٠ (بە شایەدی ئا. خۆدزکو) نالی لە شام بووە.

٩ ساڵی تەواو دەکەوێتە نێوان ئەم دوو مێژووەوە کە بایی ئەوە دەکات ئەحمەد پاشا تێیدا هاتبێتە ئەستەمبوڵ و نالیش لە دوای حەجەکەیەوە چووبێ بۆ ئەوێ و چەند ساڵانیش لای ئەحمەد پاشای بەسەر بردبێ ئەوجا هاتبێتەوە شام. هەر ئەمەش پتر جێی باوەڕ کردنە چونکە زۆر سەیرە نالی نۆ ساڵان لە مەککە وەیا شوێنێکی تر مابێتەوە بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە بچێتە لای ئەحمەد پاشا تاکوو لە پڕ دوای بێ ئومێد بوونی لە گەڕانەوە بۆ سلێمانی خۆ هەڵکوتێ بۆ لای. ئەو "نالی"یەی لەبەر سەروکاری ئەحمەد پاشا دوودڵ بێ لە گەڕانەوە چۆن نۆ ساڵان لە غەریبیدا لێی کنارەگیر دەبێ؟

باشە! وا سەلماندمان نالی دوای بەسەربردنێکی چەند ساڵە لە ئەستەمبوڵ گەڕایەوە بۆ شام، ئایا بە چ نیازێك لەوێ گیرسایەوە؟ هەر بۆیە بوو پرسی هاتنەوە بۆ سلێمانی بە سالم بکات تا وەرامێکی لێ وەردەگرێتەوە؟ بۆچی لە ئەستەمبوڵەوە پرسەکەی نەکرد؟ تۆ بڵێی مەبەستی ئەوە بووبێ بچێتە شام و کاغەز بۆ سالم بنووسێ تا ئەگەر وەرامی بی ئومێدیی وەرگرت ڕوو بکاتە مەککە؟ یاخود مصر؟ لێرەشدا هەڵوەستێکی کورت پێویستە بەرانبەر مێژوو.

"ئا. خۆدزکو" دەنووسێ و دەڵێ لەم ساڵەدا ١٨٥٣ ئەحمەدخانی لە پاریس دیتوە و لەوی بیستوە "نالی ئەفەندی" لە شامە... بەلامەوە ئاشکرایە ئەم ئەحمەد خانە ئەحمەد پاشایە. کەواتە لەو ساڵەدا ئەحمەد پاشا لە ئەستەمبوڵ نەبووە. ئەمە لە لایەکەوە. لە لایەکی تریشەوە لە قسەکەی ئەحمەد پاشا وا دەردەکەوێ مانەوەی نالی لە شام مانەوەیەکی پشوو درێژ بووە چونکە بە "ئا. خۆدزکو" دەڵێ توێژینەوەی زمانەوانی لە بارەی زمانی کوردییەوە لە "نالی ئەفەندی" بکات کەوا دانیشتووی شامە. لەمەوە دەردەکەوێ ئەحمەد پاشا (وەیا ئەحمەد خان- هەرکەسێك هەیە با ببێ) چاوەڕوان دەکا نالی ئەو ماوەیە لە شام بەردەوام ببێ تا

یـەکێکی وەك "ئـا. خۆدزکـو" بـۆی ڕێـك دەکـەوێ سـەفەر بـەرەو ڕۆژهەڵات دەکات و لە شام نالی دەبینێ.

ئایا ئەم ڕاستییەشمان تێدەگەیەنێ لەبارەی بەسەربردنی نالی لە ئەستەمبوڵدا؟ ئایا نالی دوای مانەوەی لە ئەستەمبوڵ ڕایگوێست بۆ شام؟ یاخود جارێ نەچووە بۆ ئەستەمبوڵ؟ ئەگەر وا داینێین ئەم نیشتەجێ بوونـەی نـالی لـە شـام قۆنـاغێکی ناوەندییـە لـە میـانی حەجەکەی و چوونەکەی بۆ ئەستەمبوڵ، واتە ئەگەر بڵێین تا ساڵی ١٨٥٣ جارێ ڕەفاقەتی ئەحمەد پاشای نەکردووە لە ئەستەمبوڵ، بەمەدا گوتەیەکی یەکجار پەرەسەندوولە بارەی بەسەرهاتی نالییەوە بە درۆدەخەینەوە. وا ڕۆیشتووە کە نالی بەینێکی زۆر لە ئەستەمبوڵ لای ئەحمەد پاشای بەسەر بردووە، جا ئەگەر نالی لە ١٨٥٣ لە شام بووبێ و ئەحمەد پاشاش لە پاریس بووبێ و جارێ ڕەفاقەتەکەی ئەستەمبوڵیان بەیەکەوە بەسەر نەبردبێ، ئەدی ئەو ڕەفاقەتەی چەند ساڵییان کەی بەسەربرد؟ کە ڕاست بێ نالی ١٨٥٥ مردبێ کوا ماوەی پێویست بۆ ڕەفاقەتی دوور و درێژ؟ مەودای نێوانی ١٨٥٣-١٨٥٥ هەمووی دوو ساڵە. چەند ماوە کات لەم دوو ساڵە بەسەر چوو بەر لـەوەی ئەحمـەد پاشـا لـە پاریـسەوەو نـالی لـە شـامەوە بـەرەو ئەسـتەمبوڵ بـبن؟ چ دەمێنێتـەوە لـەم دوو سـاڵە دوای داشـکاندنی بەشێکی کە بایی ئەوە بکات ئەحمەد پاشا بێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ و نالیش لە شام هەڵقەنێ و بڕوا بۆ لای ئەو؟ بەڕاستی ئەوانەی لێرە بە پێشەوە دەیانگوت نالی پێش مردنی لە ١٨٥٥، چەند ساڵان لەگەڵ ئەحمەد پاشا ڕەفاقەتیان بووە لە ئەستەمبوڵ، نەیان دەزانی "ئا. خۆدزکو" یەك پەیدا دەبێت و شایەدیی دەدات کەوا نالی لە ساڵی ١٨٥٣ لـە شـام بـوە، ئەگـەر ئەمـەیان زانیبایـە هـەرگیز حیکایـەتی وەهایان بۆ نەدەگێڕاینەوە.

ئێستا موناقەشەیەکی ساڵی ١٨٥٥ دەکەم کە نامزەدە بەساڵی مەرگی نالی لە ئەستەمبوڵ. جارێ با لە پێشەوە ئەوە بڵێم کە هیچ کەسێك لەوانـەی بـە نووسین وەیا بـە گوتـە باسـی ئـەم ساڵە دەکـەن بەڵگەیەکی تەماویش بە دەستەوە نادەن ئەم ساڵە بسەپێنێ بۆ ئەم مەبەستە، زۆریش سەیرە کەسێك لەوان باسی نەبوونی بەڵگە وەیا سەرچـاوە وەیـا هێمایـەك ناکـا و چ موناقەشـەی لـە خۆیـان بـە پێشەوەش ناکەن ئەم ساڵە لە کوێوە هات!

مـن دەتـوانم بـە ئاسـانی لـە بەدرۆخستنەوەی ئـەم ساڵە ببمـەوە بەوەدا کە بڵێم، دوای دەرکەوتنی هەڵـەبوونی هـەموو پێشەکییەکانی کـە تەسـلیم بـەم سـاڵەمان دەکـەن دیـارە ئەمیـشیان بێگومـان وەك پێشەکییەکان هەڵەیە، بەڵام ئەمە ڕەوشتێکی زەلیل گیرانەیە و لەو کەسە دەوەشێتەوە بە دوا دەرفەتدا بگەڕێ بۆ خۆهەڵدانەوە و خەڵق شکاندنەوە، کە زۆر ناجایەز و ناپەسەندیشە.

من دەمەوێ ڕاستیی ڕوون ببێتەوە، زۆریشم حەز دەکرد لێرە بە پێشەوە ڕاستی لە بارەی بەسەرهاتی نالییەوە وەها ڕوون بووبایەوە کەسی تری بە خۆیەوە ماندوو نەکردبایە، بەڵام چی بکەین کوردیی دەڵێ "خۆزگە دارێکە بەر ناگرێ".

چەند دەلیلێك و بنگەییێکی لێکدانەوە هەیە بە هیچ جۆرێك ڕازی نابێ ئەم ساڵەی ١٨٥٥-ە ساڵی مەرگی نالی بێت، یەك لەوان ئەوە بوو کە ئەگەر ئێمە تێکڕای ئەو قسانە وەریگرین کە ساڵەکەی ١٨٥٥ دەکەنە ئاڵقەی زنجیرەیەك خەبەر و بەسەرهاتی نالی، مەودایەکی ئەوتۆ نامێنێتەوە لە نێوان ١٨٥٣ و ١٨٥٥ بەشی ڕەفاقەتەکەی ئەحمەد پاشا و نالی بکا لە ئەستەمبوڵ.

بنگـەی دوەمـی لێکدانەوەکـە لـە دیـوانی نـالی دێتـە دەسـتەوە. بەشێکی هەڵبەستەکانی کە لە پیریدا داینـاون گـەلێك لـەو تەمەنـەی ٥٨ ساڵی پتر بە دەستەوە دەدەن کە دوو مێژوە شۆرەت بەستوەکەی ١٧٩٧و ١٨٥٥ پێمانی ڕادەگەیەنن. پیریی و "فانی" بوونی ناو ئەو هەڵبەستانە هی مرۆڤێکی ساڵخوردەی داهێزراوی بەسەرچوە نەك شاعیرێکی بە ڕواڵەت خۆ بەپیر لەقەڵەمداو. کەسێك سرنج ڕاگرێ لە دیوانەکـەی نـالی دەتوانـێ خـەتێکی ئاشـکرای تێهەڵکـشان بـە نـاو ساڵاندا لە شیعرەکانی بدۆزیتەوە هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی عیـشقی حەبیبـەوە تـا دەگاتـە پلـەی لێ کـەوتوویی. هەڵبـەت ئـەم شـیعرانە کـە لـە ئاوازیانـدا ناڵـەی پیریـی وەیـا نرکـەی جـوانی و جحێڵیان لێ دەفامرێتەوە، جارێکی تریش بەهۆی ڕووداوێکی کەلە ناوەڕکیانـدا دەردەکـەوێ، تەمـەنی نـالی لـەکاتی دانانیـان ئاشـکراتر دەبێ، وەك کە سەرەخۆشی لە حەبیبە دەکا دیارە ئەم هەڵبەستەی پرسەی لـەکاتی جحێڵیـدا هۆنیوەتـەوە سـەرەڕای ئـەوە کـە زرینگـەی هەڵبەستەکە بەهاری عومر دێنێتە بەر زەینی گوێگرەوە. لەگەڵ منـدا سرنج لە دەمودووی ئەم دوو نموونەیە بگرە:

-١-

بەو گریەیی تۆ ڕەنگە منیش هێندە بگریەم
گەوهەر بڕژێنم بە بڵندیی قەد و باڵات

-٢-

ڕەوغەنی دیدەم ڕژایە سەر کیتابی خطی خۆم
چاو لە ئێشی ئەو سپی نوریش بەسەر ئەودا سەقەط

هـەردوو بـەیت دەگریـەن بـەڵام دیـارە گریـانی بـەیتی یەکـەم لـە بورکـانی گـەرم و گەنجایەتییـەوە جـۆش دەدا،هـی دوەمـیش تـەپ و نمی پایزی عومرە...

**سەرچاوە:**

چـەپکێك لـە گـوڵزاری نـالی، مەسعود محەمـەد، لـە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٦.

# دەستەو دامانی نالی

مەسعود محەمەد

مێژساڵێکە مەراقی کارێکی پێویستی سەرشانی ئەدەبدۆستی کوردەواری هەستم دەڕووشێنێت و دنەم دەدات و دەستم پێی ناگات: دەمەوێ، پاتەوپات و بێ مەرایی، بڵێم شەرحەکەی دیوانی نالی لەلایەن مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس‌و، گیانشاد، فاتیحی ڕۆڵەی بێگەرد و بێتەقسیریەوە کە خانەی وێرانی خاکوخۆڵی بۆ کورد و کوردستان سەرلەنوێ ئاوەدان کردەوە و بێن و بەرامەی گوڵستان و بۆستان و بەهارستانی ئەدەبی پەردەپۆشی کەڵەشاعیری کوردی لە دەماغی خەیاڵ و خەون و خولیای هەموو هەستەوەری ناسك گێڕا، کاتی ئەوە هاتووە، ئەگەر نەڵێم پیر بووە، درزێکی سەربان و کەلێنێکی دیوار و تیکێکی تاق و پەنجەرەکانی بە کوتانەوە پڕ کردنەوە و مشتوماڵ دان کەمتاکورتە ڕەونەقێکی تازە بخەنە سەر پرشنگی چراغانی دیوانەوە کەوا لە حەقیقەتدا کارێك دەبێ بریتی لە هەڵکێشانی فتیلی چراکە نەك خواستنەوەی نەوت بۆی. لێرەشدا حەقە بەسەرمەوە لەچاو ئەدەبدۆستانی دیکەی کورد کە خۆم بەرپرسیارتر بزانم بۆ ئەم کارە، هەر نەبێ لەبەر دو هۆی سەرەکی:

هۆی یەکەم ئەوەیە کە شەرحی دیوانی نالی لەلایەن باوك و ڕۆڵەی پەرۆشدارەوە کاتێك دیارە کۆڕی زانیاری کورد بۆ لەچاپدانی یەکسەر بەمن سپێردرا بینرخێنم (ئەوسا ئەندامی تەرخان و کارای کۆڕ بووم و هەر لەسەر بڕیاری ئەنجومەنی کۆڕ دیراسەی نالی و حاجی قادرم بە ملەوە بوو، ئەوسا کە شەرحەکەی مامۆستا و ڕۆڵەی بە من درا ڕیزە گوتارم لەسەر نالی لە گۆڤارەکەی کۆڕ بڵاودەکردەوە) ئەو شەرحەی باسکراو کارێکی سادە و کەم بڕشت بوو، ڕەنگە سێیەکی شەرحی دواتری نەدەبوو. گیانشاد، فاتیح، چەند کۆبوونەوەیەکی لەگەڵمدا کرد و هەندێك لایەنی واتا ونەکانی بەشێك لە هەڵبەستی نالیم بۆ ڕوون کردەوەو، هەر لە بیرمە، بە نموونە هەوەڵ جار، ئەم بەیتەم بۆ شەرح کرد:

خاو و بێ خاوی دو زوڵفی خاوم ئەز
چاوە چاوی یەك غەزالە چاوم ئەز

گوتم: سەیرکە، لەنێو دێری یەکەمدا "خاو و بێ خاو" دوو وەصفن بۆ دوو زوڵف، لە نیوەدێری دووەمدا "یەك" هاتووە بۆ غەزال کەچی دوو چاوی هەیە. بەو پێیە "چاوەچاو" و "یەك غەزالە چاو"یش لە نگەریان لەگەڵ یەکتردا بەستووە وەك کە (خاو، بێ خاو" لەنگەریان بەستووە لەگەڵ "دوو زولف" بەدەم و تووێژی چەند ڕۆژەمان بایی بڕشتی زەینی خۆم، بەشێك لە لایەنە شاراوەکانی شیعری نالیم بۆ فاتح ڕوون کردەوە ئیتر متمانەی هات کە دەبێ جارێکی دیکە بە شەرحی دیوانەکەدا بچنەوە، وابوو کاك محەمەدی برایشی لە سەفەری هەندەران گەڕایەوە و بەشداری سەروبەری شەرح و لە چاپدانی دیوانەکە بوو تا بوو بەو شەرحە مەزنەی وا لەبەر دەستاندایە.

هۆی دووەم ئەوەیە کە گیانشاد فاتیح باوەڕی بە بۆچوونەکانی من هەبوو دەربارەی تەمەن و مێژووی ئاوارەبوون و هەڵسوکەوتی نالی لە غەریبی، سەیرێکی پەراوێزی لاپەڕە ٣١ی شەرحەکە بکرێت دەدیترێت فاتیح نووسیویەتی "ئەم بەڵگانەم هەموو لە دەستنووسێکی فلان وەرگرتووە". هەر ئەو دەستنووسە بوو دواتر بووە بەشێکی گوتارەکانم لەبارەی نالی کە بوون بە کتێبی چەپکێك لە گوڵزاری نالی بە پێشەکییەکی بیندرێژەوە. یەکەم ئاڵقەی گوتارەکان لە ساڵی ١٩٧٦ بڵاوبۆتەوە کە دەکاتەوە ساڵی لە چاپدانی شەرحەکەی مەلا کەریم و فاتیح. ساڵمەرگی نالی لە گوماندا نەما دوای ئەوەی مامۆستا عەبدوڵڵا حەدداد لە خوێندنی ئەورووپای گەڕایەوە و لە تەلەفزیۆنێك بڵاوی کردەوە کە نووسەرێکی فەرەنسی نووسیویەتی: نالی لە ١٢٩٠ك لە ئەستەنبوڵ بە خاك سپێردراوەو نووسەر خۆی لە دەمی ناشتنی تەرمەکەی حاز بووە. (من بەپێی ئەوەی باپیرم لە ساڵی ١٢٨٩ی کۆچی، نالی لە مەککەو مەدینە دیتووەو لەوێشی بەجێ هێشتووە وەهام بەدڵدا هات نالی ئەو شوێنە بەجێ ناهێڵێ لەو تەمەنەی کۆتایی ژیان. بەڵام دیارە بەهەر نیازێك بووبێ بەر لە مەرگی، ڕەنگە ساڵی ١٢٨٩ یان سەرەتای ١٢٩٠ بۆ ئەستەنبۆڵ چووە).

لەم نووسینەمدا تەنها یەخەگیری شەرحی ئەو بەیتانە دەبم کە لە دیوانەکەدا هاتووە و من جۆرێکی جودا پەسەند دەکەم. بێگومان زۆر شوێنی دیوانی نالی، جارێ بە واتاگومی ماوەتەوە ئیتر سەبەب هەرچی بێت. لە نموونەدا دەڵێم قەصیدەی "ئەی جیلوەدەری حوسن" کە لە دیوانەکەدا بە ستایشی خودا حیساب کراوە، ئەویش بە تەئویلێکی دوورەدەست، هەڵدەگرێ بە هەمان ئەرکی تەئویل،

بدرێتەوە بە مەدحی یار، بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی بەیتی سەرپەڕگی لاپەڕە ٧٦ کە دەڵێ "ئەی شەوقی ڕوخ و ذەوقی لەبت ذائیفە بەخشا" ئینجا لە بەیتی دووای ئەودا، لاپەڕە ٧٧، کە دەڵێ:

جان بەر لەبی بۆسەی لەبتە عاشقی زارت
فالبائس یستوهب من فیك معاشا

بەلای مجێزی منەوە ئەم (خطاب)ە ناشێ بۆ لای خوا هەڵگێڕدرێتەوە مەگەر بە زەبری کوتەك، دەبێ لێرەدا بڵێم، لە شەرحی بەیتی سەرپەڕگی لاپەڕە ٧٦ کە ئەمە دەقیەتی بەپێی نووسیی ناو کتێبەکە:

فەیياضی ریاضی گوڵ و میهر و مل و لەعلی
ئەی شەوقی ڕوخ و ذەوقی لەبت ذائیقە بەخشا

وشەی "مل" بە مل و گەردەن لێك دراوەتەوە کەچی وشەکە "مول- مُل"ە بە واتای شەراب دێت. هەر ئەم واتایەش جێی دەبێتەوە لە بەیتەکەدا چونکە لە هەموو بەیتەکەدا تەنها "شەراب" هەیە یەکسەر و بێ هەناسەسواری تام ببەخشێت و داوای (ذەوقی لەبت) و (ذائیقە بەخشا) بکات. ئەو سێ دێڕی وا لە شەرحی بەیتەکە هاتووە چ پێوەندییەکی لەگەڵ دەقی بەیتەکە نییە و لە ناچاریشەوە مل و گەردنی باس کردووە چونکە بۆ واتای (شەراب) نەچووە، لە کۆنیشدا (گوڵ، مول، دوڕڕ...) هەمووی (گل، مل، در...) دەنووسرا، تێکستێکی ئەو بەیتە (مل و لەعلن)ی نووسیوە. شەرحەکە تەئویلێکی بۆ ضەمیری کەسی دووەمی کۆ "لەعلن" بەوەدا پەسەند کردووە گۆیا ئەم ضەمیرەی کۆ بۆ حورمەتی خودایە کە ڕووی قسە لەوە. بەڵام ئەم تەئویلە لە خۆوە هەڵدەوەشێتەوە کە لە نیوەبەیتی دووەمدا دەڵێ: "ذەوقی لەبت" کە قسەی لەگەڵ تاکە. وەك من بۆی دەچم ئەم ضەمیرە ڕووی لە "شەوقی ڕوخ" و "ذەوقی لەبت" و بە هەردوویان دەبنە کۆ. ئەمە دەڵێم بۆ دروستاندنی "لەعلن" لە بەیتەکەدا، خۆ ئەگەر "لەعلی" بێ یەکسەر بۆ یار دەچێتەوە یان بۆ هەر شتێکی تاك بێت کە لێرەدا هەر خوا بە زەیندا دێت... تەعبیری "لەعلن" تەنها "شەوقی ڕوخ ذائیقە بەخشا" قبووڵ دەکات کە چیهرەی یارن. ئیلتیقای پۆلا و ئاسن..یش (لاپەڕە ١٧٠) کە لە شەرحەکەدا بە تێکەڵبوونی نێرومێ لێکدراوەتەوە لە ئاست داخوازیی مەقام کورت دەهێنێ چونکە گونجاندنێکی متمانەبەخش، نە بە وشەی پاتەوپات و نە بە زەمینەیەکی مەعنەوی دڵڕاگر، لە بەیتەکاندا نییە، من ڕایەکی یەکجارەکی لەم مەسەلەیەدا نادەم، هەر ئەوەندە دەڵێم شەرحەکە (لەبەر هەر هۆیەك بێت) خوتخوتەی دڵ کپ ناکات. لە نموونەدا دەڵێم وشەی (حدید) لە شەرحەکەدا مێینە و "پۆلا" نێرینە حیساب کراوە: ئەگەر قورئان بکەین بە شایەد بۆ "حدید" تەعبیری (فیە بأس شدید)ی بەکار هێناوە نەك (فیها) تەئویلێکی نەحوی هەیە دەیکا بە مێ، گۆیا وشەیەکی لە چووك کردنەوە (تصغیر)دا بوو بە مێ هەر بە مێ حیساب دەکرێت، ئیتر لەم بەیتەدا دەبێ بڵێین نالی قورئانی بەلاوە ناوە لەبەر خاتری نەحو.

نیوەی دووەمی بەیتی سەرەتای بڕە شیعرەکە لە دەستنووس یاخود چاپکراودا دیتوومە بەم شێوەیە هاتووە: (جەمعی ماء و نار مردە و زیندە و مەرخ و عەفار). ئەم دەقە نەختێك لایەنی مێ و نێر خزمەت دەکات کە خەلق بە زۆری لە ڕووی شەرمەوە بە مووی بەر دەڵێن مووی مردار. بەیتی دووەم بەم جۆرەیە:

ئەم لەسەر تەعظیم و گەورەگرتنی ئەو بێ قوصوور
ئەو لەسەر تەحقیر و تەخفیف و شکستی ژاری مار

بە پێی شەرحەکە (ئەم) بۆ ئاسنە، کە دەکا بە مێیینە و (ئەو) کە گۆیا نێرینەیە ...هتد "چاکترە خۆت شەرحەکە بخوێنیتەوە" من لەگەڵ شەرحەکە نیم کە (ئەم) لەو بەیتەدا بۆ دوور بەکارهاتووە، کە لە بەیتەکەدا پۆلا سەرەتایە و ئاسن دوور کەوتۆتەوە... بە پێی دەست پێکردنی بەیتەکە وشەی (ئەم) هەرە وشەی نێزیکە و بەرامبەر پۆلا دەوەستێ. "ئەو" بۆ ئاسنە کە دوور کەوتۆتەوە لەسەرەتای شیعر. تەعبیری "زاری مار" ژەهریش و دەمیش دەگرێتەوە: زەهەرەکە هی مارە کە دەڕشێتەوە، زارەکەش هی ئافرەتە کە ماری تێ دەچێت. لە بەیتی دوواتردا (سەرەتای لاپەڕە ١٧٣) کە دەڵێ:

ئەم بچێ ئەو دادەنیشێ دەم وەکوو گوڵ خەندەران

ئالەتی پیاو (دەچێ)و هی ئافرەت دەم دەکاتەوە... کە دەڵێ: (ئەم دەبێ هەستێ...) هەستانەکە بێ مەکەمەکە هی ئالەتی پیاوە. لە بەیتی دواتردا: (ئەم بەچاو دوڕڕ و بەسەر لەعلی هەدییەی بۆ دەبا) دیسان هەر ئالەتی پیاوە دوڕڕ "لوولوو"ی سپی لە کونی تاکە چاویەوە هەڵدەڕێژێ و سەروکەللەی سوورهەڵگەڕاویشی وەکوو لەعلی سوورە ئەمما زلە وەك "سەر" پێشی دەگوترێ سەر...

خولاسە لەگەڵ تێڕای ئەم قەصیدەیە و شەرحەکەی دیوان نا ئارامم... خوێنەر بمبەخشێ شتێکی متمانە بەخشم پێ نییە. لەوانەبوو ئەگەر بڕە شیعرەکە بە ڕێنووسێکی بێقۆرت و ڕاست و دروست نووسرابایەوە باشتر سەرەدەری لی ٘کرابایە بەڵام داخم ناچێ. ئەم عوزرە بۆ من و بۆ شەرحەکە و هەموو کەسێك ڕەوایە. لێرەدا بەیتەکە دەنووسمەوە وەك لە شەرحدا هاتووە:

ئەم بچێ ئەو دادەنیشێ دەم وەکوو گوڵ خەندەران
ئەم دەبێ هەستێ کە ئەو بێ چاو یەك وقەطرة هەزار

بەیتی هەرەدووایی قەصیدەکە کە بریتییە لەمە:
نەظمی نالی میثلی ئاو و ئاوێنە ڕەنگی نییە
دوو ڕووە بۆ سەیری خاطر: یەك خەفی و یەك ئاشکار

وشەی "ئاوێنە" بەیتەکە تەنبەڵ دەکات و مۆسیقاکەی تێك دەدات. لە پەراوێزدا تێکستی "ك" ئایینە"ی نووسیوە کە عەیبی لێ ناگیرێ. لزومیش نییە گیانی کوردایەتی بە دواکاتەوە خاوەنی بەشێ لەو تێکستانە (عم و ت و عب و من) وشەکە بگۆڕن بە

"ئاوێنه" و بەیتەکە عەیبدار بکات: وا لە پایانی بەیتەکەدا وشەی "ئاشکار" زەق زەق بە فارسی دەدوێت و نەشکرایە ئاشکرا... راستییەکەی شوعەرای ئەو سەردەمانە هەتا لە پایەی شاعیرییەت هەڵدەکشان هەڵبەستیان بە وشەی دڵپەسەندی ئەوسا دەڕازاندەوە. بە نموونە سەیرێکی وەڵامەکەی سالم بۆ نالی دەبینی "ئابی حەیات و ئاتەشی ئەفسوردەیە دەمت" وشەیەکی کوردی و (کە فارسیش بەکاری دەهێنێت "دەم") یەکێکی عەرەبی و سێی فارسی بەکارهێناوە لە نیوەبەیتێکدا.

لێرە بەدواوە خەریکی کارەکە دەبم بەو جۆرەی لە سەرەوەتر ڕامگەیاند، ناوناوەش ئەگەر هەڵەیەکم دیت یاخود جۆرە ڕێنووسێکی ئەوتۆ کە نالی لەو سەردەمە بەلایدا نەچووە، زەینی خوێنەری بۆ ڕادەکێشم. ئیتر پەنا بەخوا بە چاوپۆشی خوێنەران لەکەم و کەسەرییەکی بڕیاری ناچاری بەسەرمدا دەسەپێنێ.

بەیتی یەکەمی لاپەڕە ٩٠:
شەبەهی زولفی شەبەهـ گۆنەیە، ڕووگەردانی
بەسەری ئەو کە بە سەودا سەر و سامانم دا

ئەو شەرحەی بۆی دراوە لەو وشانە هەڵناستێ، گۆیا ئەمە واتایەتی: "کە من سەر و سامانی خۆم لە دڵداریدا، یا بە مامەڵە، دا بە سەری زوڵفی یار و ئەویش نەیدا و ڕووی وەرچەرخاند، زولفی ڕەشی دەرخست و دنیای لێ تاریك کردم... لەو دەقەدا مومکین نییە "ڕووگەردانی" ببرێتەوە بۆ "ڕووی وەرچەرخاند. ڕووگەردانی بریتییە لە (مضاف و مضاف الیە) ئەوەی پێی دەڵێن (اسناد) بۆ (جملەی خەبەری) تێیدا نییەو نابێ. ئەگەر بیخەیتە پێش هەموو بەیتەکە و بڵێی: (ڕووگەردانی شەبەهی زوڵفی شەبەهـ گۆنەیە) ئیسناد پەیدا دەبێ بەڵام واتای دروستی نابێ. ڕەنگ بوو ئەگەر بە ڕێنووسی سەردەمی نالی بەیتەکە نووسرابایەوە سەرەدەریەکی لێ کرابایە چونکە لەوانەیە شەبەهی ، شەبەهـ گۆنە.. شبهی یاخود شبه... نووسرابایەوە لەگەڵ ڕێنووسی هەموو بەیتەکەدا وێنەیەکی مەفهومی بە دەستەوە دابایە.

لە لاپەڕەی ٩٢، بەیتی یەکەم:
شیرەیی جانە وتم یا مەیە چا بوو فەرمووی
عەکسی لەعلی لەبی مەرجانە لە فنجانمدا

پێویستە بڵێم (شیرەیی جان) دەست نادات چونکە مەبەست ڕەنگە عەکس بداتەوە. ئینجا کە (یا مەیە)ی بە دوادا بێت لە جیاتی ئەوەی بەیتەکە سەرەوژوور چووبێت لە واتا و ناوەڕۆك، کەچی دابەزێ لە بۆ ڕێکاری شەراب کە زۆر بەرەژێری جانە. (شێوەیی جامە) ڕاستە وەك لە بەرەوەی شەرحەکە هاتووە.

شەرحەکە ڕاستەواتای وشەکانی لێك داوەتەوە، بۆ وردیاتی بەیتەکە نەچووە، نالی دەڵێ: شێوەی جامە (کە ڕەنگی ئاڵ دەنوێنێ) یان شەرابە؟ یار فەرمووی عەکسی لەعلی ... هتد. عەکسی لەعل کە جاران (لعل) دەنووسرا ئەویش کە لە خوارەوە بۆ سەرەوەی بخوێنیتەوە هەمان (لعل) دێتەوە. لێوی مەرجانی یار عەکس بۆتەوە وەك لەعل، لەعلەکەش عەکس بێتەوە هەر خۆی دەردەچێت.

عەکسی لەعلی لەبی مەرجان: لە نێو شیعردۆستان (لەبی مەرجان) پیتی سەرەتای مەرجان دەبەخشێت کە "میم-م"ە ناوی ئەم پیتەش وەك "لعل" بە مەعکووسیش هەر دەبێتەوە میم. خۆ ئەگەر پیتی کۆتایی زاری پێ تەشبیە دەکرێ وەك نالی خۆی گوتوویەتی (لەبت میم و قەدت ئەلف‌و ...) خولاسە نالی تەماشاخانەیەکی سازداوە هەر دەبێ تێوەی ڕامێنیت.

بەیتی دووەمی لاپەڕە ٩٢:
بەحثی سیڕڕی دەهەنی نوقطە بە نوقطە بگەڕێی
سەری موویێ نییە نوکتە لە دیوانمدا

شەرحەکە بۆ ڕاستەواتای ئاشکرای بەیتەکە چووە، وردەکارییەکی تێدایە باسی نەهاتووە. نالی لە نووسینی خۆیدا وشەی کۆتاییی نیوەدێڕی یەکەمی "بکرێ" نووسیوە. هەر ئەمیش لەگەڵ (بەحث) (باس) دا خزمە، گەڕان لێرەدا جێی نییە.

کە دەڵێ "سەری موویێ نییە بێ نوکتە" مەبەسیەتی بڵێ پیتی سەرەتای موو کە میمە "م" نوکتە "مەبەس نوقطەیشە"ی بچێتە سەر لە لەفزی "مو"دا، دەبێتە "فو" کە لە عەرەبیدا بە واتای زار دێت. نالی خۆی لە شیعری دیکەی گوتووە: لەبن میم و قەدت ئەلف‌و... بەو پێیە باسی "سیڕڕی زاری" (لەبەر زێدە بچووکی وەك سیڕڕە" لە هەموو دیوانەکەدا هەیە، نەك بە قسە و ئیدیعا بەڵکوو هەر سەرە موویەك بێ نوکتە نییە لە دیوانەکەدا، هەمووی زارە.

بەیتی سێیەمی لاپەڕە ٩٢:
نالی ئەو نوقطە کەوا بوو بە نیشانەی چاوی
من لە صەفحەی ڕوخی ئەو دولبەرە نیشانم دا

من لە نوسخەکەدا دیتوومە لە جیاتی "کەوابوو" نووسراوە "کە بوو بوو". کە لە سەرەتاکانی حەفتاکاندا لەگەڵ مەرحوم هەژار ئەندامی کۆڕ بووین ئەم "بوو بوو"ەمان بۆ یەکتر باس کردووەو هەر یەکە لەلای خۆیەوە بۆ واتاکەی چووبوو.

نالی دەڵێ: ئەو نوقطەی بۆتە نیشانەی چاوی، واتە هەمیشە چاوی تێبڕیوە، لە هەمان کاتیشدا بیلبیلەی چاو دەگرێتەوە، تومەز عەکسی ئەو خاڵەیە لە ڕووی یار.

فیعلی "بوو بوو" کە دەنووسرا "بوبو" مانای بیلبیلەشی هەیە کە بە عەرەبی (بؤبؤ" ەو لە گوتەی کوردیدا هەمزەکەی سوواوە. شەرحەکە بۆ ئەوە چووە کەوا ڕەنگە، بە پێی مەعنایەکی شەرحەکە خۆی لێکی داوەتەوە، نالی تانەی بەسەر چاوەوە هەبووبێت. ئەم بۆچوونە بنەمای نییە.

بەیتی دووەمی لاپەڕە٩٣:
عیشقت لە دڵ و دیدەیی پڕ ئەشك و ئەلەمدا
گونجایش و تەسکینی نییە زۆرە لە کەمدا

شەرحەکە لە هاتنی ئەشك و ئەلەم بە دوای دڵ و دیدەدا لەفف و نەشری موشەووەشی بەدی کردووە کەوا دڵ لە تەرتیبدا کەوتۆتە بەرانبەر ئەشك، دیدەش کەوتۆتە بەرانبەر ئەلەم. منیش دەڵێم لە هەمان کاتدا لەفف و نەشرێکی موشەووەشی دیکەشی لەوەدا پێك هێناوە کە گونجاویش کەوتۆتە بەرانبەر دڵو تەسکینیش کەوتۆتە بەرانبەر دیدە کە دەبوو تەسکینەکە لەگەڵ دڵدا جووت بێت و گونجاویشیش بۆ دیدە.

لە ئاست بەیتی یەکەمی لاپەڕە ٩٤:
لافی دەمی تۆ، غونچە لە دەمیا بوو، بە عەمدا
با خوستی بڕی، خستی، کە مستێکی لە دەم دا

لەم شەرحەدا دەبینم "خوست" بە واتای دامەن بێت. دەگوترێ "هەستوخوست" وەك کۆمەڵێك بێژەی ئەوتۆیی: شڕوشیتاڵ، کڵوکۆ، چشتومشت، کەلوپەلی ... دەشگوترێ پێخوست، تۆبڵێی ئەم خوستە هەمان دامەن بێت؟

شەرحەکە دەبوو بڵێ وشەی "عەمد" لەوەوە هاتووە کە بایەکە بە ئەنقەست مستی لە دەمی غونچەکە دا چونکە لافی دەمی یاری تێدا بوو.

لە کۆتایی میصرەعی یەکەمی بەیتی دووەمی لاپەڕە ٩٤ "دیدە لە نمدا" نووسراوە. بێگومان نالی "دیدە لە نەمدا"ی مەبەست بووە چونکە هەر دە قافییەی بڕە شیعرەکە: ئێرەمدا، حەرەمدا، ئەلەمدا، لەکەمدا، بەعەمدا، لەدەمدا، لەنەمدا، لەیەمدا،... غەمدا، قەڵەمدا ئەو پیتەیان فەتحەی بەسەرەوەیە.

بەیتی لاپەڕە٩٥:
نالی مەثەلی لە ئەشکەنجەیی غەمدا
وەك ناڵە لە نەیدا وەکو ناڵە لە قەڵەمدا

شەرحەکە "ناڵ"ی بەو ماددە شکڵ لۆکەی ناو قەڵەمی قامیش لێك داوەتەوە، ڕاستیشی بۆچووە. ئەم وشەیە واتایەکی دیکەش دەبەخشێ کە ناڵی ولاغە، قەڵەمیش بۆ پێی ولاغە وەك دەگوترێ: قەڵەمی دەست و پێی شکا. لەهجە هەیە بۆ دەست دەیکاتە "قولەم". لەلایەن ئەشکەنجەوە، ناڵە و ولاغ پتر لە لۆکەی ناو قەڵەم بە ئازارە...

شەرحەکە وای ڕانواندووە کە "ناڵە لە نەیدا" ئیشارەتی تێدایە بۆ بەیتی مەثنەویی جەلالەددینی ڕوومی کە دەڵێ:

بشنو از نی چون حکایت میکند
وز جدائیها شکایت میکند

گۆیا قامیش لە ژێر پێدا زیکەی دێ، ڕازی خۆی ئەگێڕێتەوە و سکاڵای دەردی دووری دەکا... وەك من بزانم "نەی" لەو بەیتەدا شمشاڵ مەبەستە لێی کە نەغمەی لێ پەیدا دەبێت و سۆزی دڵێك دەداتەوە. جەلالەددینیش هەر ئەمەی مەبەست بووە نەك زیکەزیکی قەمیش و زەل.

لە لاپەڕە ٩٧، دێڕە شیعری:
ئەحوەلی تەفرەقە نەظەر تەقوییەتی سەبەب دەکا
عاریفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا

لە شەرحەکەدا هاتووە کە دەڵێن ئەم پارچە شیعرەی لە ڕەتدانەوەی موفتی زەهاوی، باوکی جەمیل صیدقی زەهاوی، داناوە لەوەدا کە موفتی سەلماندوویەتی بە تەئسیرە و "ئەحوەل"ەکەش هەر موفتی تێدا مەبەستە. ئەم باسە لە منەوە بیسترا: ساڵی ١٩٣٨ (یان ئەو دەوروبەرە)کە من بە مێوانی هەمیشەیی لە ماڵی مەلا ئەفەندیی هەولێر خوێندنی سانەویم تەواو دەکرد، موناسەبەیەك بوو مەلا ڕەفیق ئەفەندی خادم السجادە هاتە سەردانی مەلا ئەفەندی دەوری دوو حەفتەیەك مایەوە و تابڵێی لە زەتم لە قسەکانی دەبرد و بە گەلێك لادا دەرگەی وتووێژی ئەدیبانەی دەکردەوە... یەکێك لەو شتانەی لەوم بیست، لە ناوتوێژی دووانی لەسەر نالی و ئەم قەصیدەیەی "ئەحوەل..." گوتی: موفتی زەهاوی پلارەکانی ناو قەصیدەکە و ئەحوەلی تەفرەقە نەظەری دەبردەوە سەر خۆی کە نالی ئەوی تێدا مەبەست بووە. ئیتر نازانم ئایا موفتی خێل بووە یان نالی لەبەر "سببیة" کە وەك شیرکە بەلای "وەحدەت ئاشنا" وە بە خێلی حیساب کردووە، کە خێل یەك بە دوو دەبینێ.

هەر لە بیرمە ڕەفیق ئەفەندی لە خوێندنەوەی شیعرە فارسیەکەی شێخ ڕەزا کە مەدحی صەدری ئەعظەمی پێ کردووە کاتێك گەیشتە نیوەبەیتێك کە دەڵێ: "نە سازد چیزکی گر بر معاشم صدر أعظم ضم" ڕەفیق ئەفەندی گوتی ئەم قافیەیەی "ظم" و "ضم"ی وەك یەك داناوە وەیا "س، ص" دەکاتە قافیەی شیعرێك پێی دەگوترێ "شایگان- شایەگان". کە ئەم حکایەتەم بۆ مەرحوم هەژار گێڕایەوە زۆر گەش بۆوە کە زاراوەکەی بۆ ڕوون بۆوە. حاجی قادر لە بڕە شیعرێکی خۆی دەڵێ "ئەم قافیە شایەگانە ئەمما..." سەرەتای قەصیدەکەشی ئەمەیە:

بەم نەحوەیە صەرفی عیشقبازی
موستەقبەلی زۆرترە لە مازی

ڕەنگە وشەیەکی تری تێدابێ لە جیاتی "زۆرترە" وەك بڵێین "ڕوونترە..." یان هەرچی هەیە ببێ. دەبوو بڵێم قافیەی سەرلەبەری قەصیدەکەی مەدحی (صدر أعظم) دووبارە کردنەوەی یەك وشە بوو کە سەرەتا بەمیان دەستی پێ دەکرد:

مزن بیهودە از فضل و هنر ای یار همدم دم
کە از فضل و هنر بهتر بود دینار و درهم هم

سەرچاوە:
دەستەودامانی نالی، مەسعود محەمەد، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٧.

# حاجی قادریی کۆیی

مەسعود محەمەد

چەند کەسانێك هەن لە مێژووی کۆن ونوێی ئادەمیزاد هەرکە ویستبێتم زمانی خامەیان بۆ بە دەنگ بێنم، ئەو شعوورە گرتوومیەوە کەگیانی یەکێك دەگرێتەوە لە میحرابی پەرستندا وەستابێ. لە ودیو پەردەی وجوودی زیندەگانییەوە، لە مەلبەندی سەرابی وتەماوی مەرگەوە، ئاورینگی خەیاڵی چاوخێرەکەر وەك تیشکی بەیانیان کە لە شەبەقی فەجرەوە باڵی فراوانی سەر تاسەر ئاسۆی مەشریق دەگرێتەوە، بەوجۆرە دەکشێ بەسەر هەست وزانینم

تا دەڵێم ڕۆشنایی ئیدراکم کز کز غەرقی ئەودەریای نوورە بوو، لە ناو شەپۆلە تریفەدارو سامناکەکانی پەی دەرپەیدا نابوود بوو شەوقێکی خۆنیشاندەری نەما.تەکان دەدەم ڕەشتەی فکرم سەروەدەرنێ لە بن شەپۆلی نوورین وچاوێکی تەماشا وسرنج هەڵێنێ،زەحمەتیی تەقەللا وتۆفانیمەوج دەرفەت نادەن وفکرم ئەسیری ئەوتەلیسمە نوورێنەودەریایە بەلوورێنە دەمێنێتەوە وەك لەککە لە ڕووی ڕۆژ.بەپێدزیلکەی ئاهیستە پەنای ئیدراکم دەبەمەبەر نواییێکی کەناری ئەو دەریایە تریفەدارە بۆ لەحزەییێك دیدەی نیوە خنکاومی لێ دەتروکێنم کەچی هەیهات.

کەعبە ئیشراقی وەکو خورشید ومن چاوم خەفیف لێم بووە ڕەوشەن کەبوعدی قوربە،قوربی بوعدە بۆم.ناچار بەکوتەکوتی شەوکوێرانە وترسی سەرەوبن بووبن لێرە گەوهەرێك ولەوێ دەسکێك لە ڕەنگەکانی قوزەح ولەولاچەپکێك لە گوڵی ئەفسووناوی وکۆشێك لە میوەی گیا پاکان بە شەرمەوە کۆدەکەمەوە تا بیانکەم بە دیاری ناچاری لە مەلووکەتی عەدەمەوە بۆ دونیای ناسووت.

هۆی شەرم وشکۆی تەقدیسکارانەم بەرامبەر ئەو کەسانە پاکی وگەورەییانە.بەهەر مقیاسێکیوردی هونەرکێش وجەوهەرپێو ڕەوشت وکردەوە وئەخلاقیان قیاس دەکەم سەنگ ونرخیان لە وزەی ئەندازەکێشان دەردەچێ.

ڕاستگۆیی
فیداکاری بۆ باوەڕی ئینسانانە
خۆبەخت کردن لە پێناو غەیر
خۆ لە بیر کردن
نەبوونی ئامانجی شەخسی لە کردەوەدا
ئازایی لە پێهەڵستان بە واجیب
گەردەن فیرازی لە عاست ترس وتەماع

ئەمانە وڕەوشتی ئەوتۆیی دروشمی گەورەیی ڕاستەقینەن.

من چ بکەم لە قوماندانێك بەهۆی لەشکری زۆرەوە سەد وڵاتی کاوکردبێ

چیمە لە پاڵەوانی نەترساو بۆ ئارەزۆی نەفسی خۆی قەڵاتی لە کەللەی بەشەر دروست کردبێ!

چیم بەسەر قاروونەوەیە لە ڕێی دەستبڕین وفەند وفێڵەوە باری هەزار حووشتر زێڕ وئەڵماسی کۆمەڵکردبێ !

خەفرەع وخۆفۆم بۆ چیە بە زەبری قەمچی هەڕەمی سەرسووڕێنیان بنیادنابێ!

بە من چی سیاسییێك بەسەر کەلەشی هاوڕێکانیدا گەیشتبێتە پۆپی هەرە بەرزی دەسەڵات.فێڵبازێك خۆ دەکاتە معبودی میللەتەکەی...چش.

زاڵم وزۆردار وخوێنڕێژ مێژوودەهەژێنن ودونیا دەشڵەقێنن.ئەمانە هەموویان گورگ ودڕندەن.دوشمنی ئادەمزادن.گەورەی چەنگاڵ وددانن.خوێنی خەڵق لە شادەماریان فڕکەی دێ.ئەمانە وەك شەمشەمەکوێرەلە تاریکەشەوی مێشکی من وتۆدا پەروازدەکەن.هەر چاومان هەڵێنین دەڕمێن.

ئەمانە لەبەر بچووکی ئێمە زلن. ئەولەحزەی من وتۆ خۆبەکەم نەگرین دەبنە هیچ.

من وتۆ خەڵقمان بۆ کوشتوون، هەڕەممان بۆ کردوون...بۆیان کۆشاوین وجەنگاوین...پشتمان بۆ قەمچێکەیان چەماندۆتەوە...عەبدایەتیی من وتۆ کردوونی بە عفریتی تەئریخ.

مەڵێ خۆفۆ وقاروونم بەگەورە قبوول نەکردوون...مەلعوونی وەك ئەوان ئێستەش دەپەرسترێن.

تاگەورەییێکی درۆزن دەردەکەوێ دوو سێیەکی تازە دەبنەوە گەورە. کوردی قسەییێکی هەیە دەڵێ ئۆباڵی خۆت بەئەستۆی خۆت.من وتۆش لەپەرستنی بوتی ڕووح لەبەردا ئۆباڵمان بە ئەستۆی خۆمان سەدجار عوزری ئەوە بێنینەوە کەتێنەگەیشتین هۆی بووت پەرستییە عوزری وا دادمان نادا.کەتێنەگەیشتووبووین بە عوزروو بێ عوزر دەبینەخزمەتکار ومەڕوباربەر...

حورمەت وماف لەخۆوە بەرەوپیرت نایەن. پایەیێک هەیەلە هۆشیاری وئازایەتی کەلەوە ژێرکەوتی نە حورمەتت دەبێنەماف. ئەگەر یەکێك پایەی لێ نای وەیامافی پێدای لەچاکەی خۆیەتی...خێرت پێدەکا.پیاوبەوحورمەتی خۆت بسەپێنەومافی خۆت بپارێزە.مەبەنۆکەری درۆزن وفێڵبازان.

لەبیرت نەچێ کورد دەڵێ کە جارێکت فێڵ لێ کردم خوا بتگرێ...کەدووجارت فێڵ لێ کردم خوا بمگرێ.

خۆت مەکەبەکێڵگەی تەجرەبە بۆ تەماعکار...تەماعی ماڵ بێیا هی شۆرەت یاهی دەسەلات.کەتێت ڕاخۆڕن وبڵێی بەڵێ بەچاوان حەقی ئەوەت نامێنێ گلەیی لەم ولەو بکەی.بۆ خۆت ئامادەی ببی بەنۆکەر.

کەماڵت بخۆن ودەنگ نەکەی،دیارە ماڵەکەبە هی خۆت نازانی دەنا بۆ دەنگ ناکەی؟ دەڵێی تەنهام...نەخێرڕاست ناکەی تۆتەنهانی...تۆ زوربەی میللەتی...دەڵێی ماڵخۆرە کەچەکی هەیە؟خۆ تۆ وەیا وەك هی تۆچەکی بۆ هەڵگرتوە.هەرخۆت چەکهەڵدەگری بۆ زۆردارێکی دیکە دژی ڕووتەییێکی وەك خۆت. گوتم ڕووتە.ڕووتەی چی؟کێ بێ لە نووسیندا ئاخاوتنی لەکەڵ بکرێ خوێندەوارو خاوەن شەهادەنەبێ؟ تۆ کەئەم قسانە بخوێنیتەوە یەکێکی لە بەری مومتازی ئەم میللەتە...تۆ خوا شەرم مەکەوبڵێ چەندجاران ویژدانی خۆت ورتەڵێ بڕیوە وکاری ئەوتۆتکردوە دەروێشی جەزبەدار وەیا بوتپەرست نەبێ نای کا؟ زۆرم دیوی بەرامبەر بوتێکی فێڵباز دەمەبەشکەت گەیشتۆتێ.وەی حەزم دەکرد کوڵەمستێکی دڵسۆزانە لەبەری چەناگەت دەمەبەشکەی نەهێشتبای.براکەم،خۆشەویستەکەم هەموودونیای درۆزنان وفێڵبازان وبوت وسەنەمان یەك دانە تۆی گەورەیی ویەك زەڕڕە جەوهەری مرۆڤایەتی تێدانیە...هەر نمایشتێکی تێیدادەکرێ وچەپڵەڕێزانێکی بەرپا دەبێلە حیلەگەریی"معبود"ە کەوسادەیی وترسنۆکیی بوت پەرستەکانەوەیە.ڕاستیش بەچەشمەبەندێ ناگۆڕێ،ڕەش بەقسە سپی نابێ.سەدئەوەندە ئاهەنگی تقدیس بگەڕێ لە مەیدانی سافیلکاندا بۆ هەڵدانەوەی پاڵەوانی درۆزن،حەقیقەتی گەورەیی هەردەمێنێتەوە بۆ ئەو ڕەوشتانە کەلەپێشەوە گوتم دروشمی گەورەیین.گەورەیی لەسەر حیسابی خەڵق وبە هۆی فەند وفێڵ وساختەگەریی جەردەییە.

بەومقیاسەی ڕاستگۆیی وفیداکاری وخۆبەختکردن ونەویستنی سوودی شەخسی، حاجی قادر یەکێکە لە مرۆڤە هەرە زلەکانی سەردەمی نوێ

حاجی قادر ڕاستگۆی مەحزە، پەیکەری خۆبەختکردنە،نموونەی زوهدە، سەردەفتەری گەردەن فیرازانە لە عاستی ترس و تەماعدا.

لەو جیهانە بەرینەی پڕلە ئەسبابی لەززەت وشەهوەتەدا،حاجی قادر بایی سەرەدەرزییەك ئومێدی خۆشی وحەزی جاه وشکۆهی نەبووە...نەك نەیتوانیوە هەیبێ...بەدڵی خۆی تەڵڵاقی داون، وازی لێ هێناون لە پێناوی ئەوشتانەی وان لە نوقتەی بەرانبەریان کە خۆنەویستی وعیشقی میللەت وسەودای نیشتمانپەروەرییە.

وەك بێی کاسەی پڕلە شەرابت بەتاڵکەی وپڕی کەیەوە لە ژیلەمۆ، حاجی قادریش بە پێی داخوازی ئەو واجیبەی خستۆتیە ئەستۆی خۆیەوە، دوادڵۆپی حەزی دارایی وکاخنیشتنی وئاوریشم پۆشی لە دڵی خۆی تکاندوە ولە جێی ئەواندا دەستە چیلەی حەق پەرستی و وەتەن خواهیی ومیللەت دۆستی هەڵکردووەوخۆی پێ ڕوون کردۆتەوە وبۆی سووتاوە.

ئەم کارەی دڵ ودەروون ومێشك پاك کردنەوەیشی کارێکی تەواوبێ کەم وکەسری وسەدلەسەدبوە...چی دیکەی بە بەرەوە نەماوە.

لەو هەموو پەیوەندییانەی خەڵق دەبەستێتەوە بەدونیا وجموجووڵیان پێدەکا وەك پوورە هەنگ،حاجی قادر لەتاکەیەك پەیوەندیی زیاتر بە دونیاوەی نەبوە،ئەویش پەیوەندیی خوولیای وەتەن پەروەرییە لە هەموو ڕوێکەوە:

خۆشویستنی خاکی کوردستان و خەڵقی کوردستان وزامنی کورد ومافی کورد وهەموو شتێکی کورد. حاجی کەدەڵێ:

هەر منم ئێستە وارسی عیسا

بێ کوڕو ماڵ و بێ ژن و مەئوا

ئەگەر بۆ مەبەسی "مفارەقە"شی بێ بە ڕێکەوت تەرجەمەی ڕاست وڕەوانی حاڵی کردوە، تەنانەت ئەوەندە ڕاستە دەتوانین هەندێکیشی لێ زیاد کەین وبڵێین لەگەڵ نەبوونی کوڕوماڵ وژن ومەئوادا حەزی پەیداکردنیشیانی گۆڕیوەتەوە بە حوبی وەتەن تا وای لێ هاتوە بەغەیری سورەتی کالاَ وبالاَی کوردەواری لە سەفحەی گیانی...لە پەڕەی دڵی...لە پەردەی وەهم وخەیاڵی لە لەوحی خەون وبەخەبەریی ئەودا نەك هیچ سورەت بەڵکووتارمایی سورەتیش نەبوە."لیس فی الدار غیرە دیار"

لەو کارەی خۆنەویستییە وخۆبەختکردنە وخۆلەبیرچوونەدا حاجی قادر شەقڵێکی لە خەرمەنی شەرافەت

داوە بە کەس نەشکێ.

سەخاوەتت دەوێ؟ خزمەتی بێ مزەیە سەخاوەت.

وەتەن پەروەریی ڕاستت گەرەکە؟خەباتی بێ ئامانجی شەخسییە.

خۆ سووتاندن بۆ ڕووناك کردنەوەی غەیر دڵسۆزیی تەواوە.

خولاسە بە خۆ وێران ونەفس بەزاندن پاڵەوانییە، قارەمانییە، گەورەییە.خۆ ئەگەر بە پاڵ ئەمەدا سوودی میللەت وئازادی نیشتمان ووەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتیی وبەرزکردنەوەی ناو وحورمەتی خاك وگەل هاندەربێ بۆ ئەو خۆنەویستییە،ئیتر تێکڕای ئەم کارە کاری فرشتەیە سەرەڕای پاڵەوانەتی وقارەمانەتی.

بەو مقیاسە حاجی قادر پلەیێکی گەورەیی نەهێشتۆتەوە لێی سەرنەکەوتبێ.تا لەوهەمووپلانەش سەرکەوتووە هەرچی حەزی شکۆهـ وجاهـ وسامان ودەسەلاَت وسوودی مادی بوە لە ژێر پێی خۆی داناوە.بەوە نەبا لەو پلانە سەر نەدەکەوت.

هاوچەرخانی حاجی، ئەوەی ناوودەسەلاَتێکی بوە خۆی هەڵکوتاوە بۆ ئەستەمبوڵ،ناوچەی خەلافەت،تا زۆروکەم شتێك زیاد

کا له پایه ودەسەڵات ودارایی خۆی.لەمەدا کەسیش عەیبی لێ نەگرتوه ولەوسەر که هاتۆتەوه بۆ شارەکەی به خۆ وبه ڕوتبه ونیشانی تازەیەوه هەموو کەس ڕێزی زیادی لێ ناوه وبۆ ڕوتبەی دەستەونەزەر وەستاوه.خۆ ئەگەر حاجیش کارێکی وای کردبا وڕوتبەیێکی وەرگرتبا لێی به عەیب نەدەگیرا،ئەوڕۆش لێی به عەیب ناگیرێ. به تورك وعەرەب وبولغار وئەرنەهووتەوه، به پاشا وبەگ ووالی ومەلا وشێخ وتوجار وئاغاوه ئاستان بۆسی "عبد الحمید خان و سلطان رشاد"یان بەلاوه ئەوپەڕیی گەورەیی وشانازیی بوو،ناوی کرێکار وفەللاح وعەتار وبەقاڵ ناهێنن چونکه ئەم هەژارانه له وەزعێك نەبوون ئەوسا خەون بەو شەرەفەوه ببینن، وەك ئێستا ئاواتیان لەگەیشتن به قایمقامێك یا"متصرف"ێك تێپەڕی نەدەکرد. ئەمەیه واقیشی بێ درۆی سەردەمی حاجی قادر.دەوجا که حاڵ ئەمەبێ و له نێوان گرۆهی سەرامەدانی ئەوساکەدا پێشبڕکێ له یەکدی کردن مەودای تەسك دەکردنەوه له گەیشتن به پابۆسیی "خلیفه"شەخسی حاجی قادری خاوەند کەرستەی ئەدەبی خۆ ڕەپێش کردن وخامەی تیژوفکری تێروتەژی، له هەمان کاتیشدا بێ پاره وپوول،لەجیاتی مەدح وتەقدیسی خەلیفه بەوپەڕی سادەییەوه بڵێ:

ئەمە کەر میزه دەڵێن وارسی شەرعی نەبەوین
هەموو عەبدی سەنەمن باسی مەکە گەورەکەیان

له تەك ئەمەدا هەڵبەست بنووسێ له مەدحی عەلی بەردەشانی که شایەرێکی مردووی لاتی کوردە.

ئا ئەم حاجی قادره دەبێ حیسابێکی تایبەتی بۆ بکرێ له ژووروی حیسابی گەوره وقارەمان وفریشته کەناویان بەسەر زمانانەوەیه.دەبێ وەك بۆ کارێکی مقدس دەکرێ، بۆ نووسین لەبارەی حاجییەوه دەستنوێژێکی پێشەکی بشۆرێ و تۆبه واستغفار بکرێ.دەبێ ئەوزمانه لاڵبێ له عاست حاجیدا به خواری بگەڕێ.دەبێ ئەوپەنجەیه بشکێ وریسوا بێ له باری حاجییەوەبه بێ ئەدەبی شت بنووسێ.دەبێ میللەت شەرم بکاتەوه له خۆی کەهۆشی بەوه نەشکێ قەرزی حاجی بداتەوه وچاکەی بکاتەوه.کوردی دەڵێ دار پیر دەبێ جارێك بازی لێ دەنیشێ.دەیان ساڵیش تێپەڕ دەبێتامیللەت یەکێکی وەك حاجی بەرهەم دێنی یا نایەنێ. بەقەدەر گەورەیی حاجی عەیبی میللەتەکەیناقۆڵا دەنوێنی له کەمتەرخەمی دەربارەی یاد وناوونیشانی. ئەوکەمتەرخەمییه له ڕووی تێنەگەیشتنەوه بێ یا له ڕووی خۆ به سەهو بردنەوه بێ فەرقێکی ئەوتۆی نیه، چونکه بەرادەی خۆ به سەهوبردنەوه بێ فەرقێکی ئەوتۆی نیه، چونکه بەرادەی خۆ بەسەهوبردن تێنه گەیشتنیش له چشتی ئاشکرا عەیبه بۆ میللەت. چۆن ڕەوایه خەڵق بزانێ فلانه ئالاشر وابەسەر قەبری دەروێش فلان و سووفی فستانەوەزیارەتی بکا وخۆ له بەردەکانی هەڵسوێ بەلام نەزانێ فریشتەیێکی وەك حاجی له جەرگەی جەرگییەوه پێگەییوه وتێگەییوه وپێیدا هەڵگوتوه وبۆی تلاوەتەوه وجانفدانی بۆکردوه تاناوی بەرز کاتەوەومافی بپارێزێ؟ له فەرزی بڵێین زوربەی میللەت له خۆوه پیاوی وەك حاجی ناناسێ لەبەرئەم هۆیه وئەو هۆیه کەوا بەلای منەوه هەمووی مەرفووزن وهیچیان تەبریری نانکوێری وبێوەفایی ناکەن. خۆ خوێندەوارونووسەر وڕابەری فیکری ئەوچوارییێکه عوزرەشیان نیه که بڵێین زوربەی میللەت هەیەتی.بۆ دەبێ ئەدیبێکی کورد خۆ خەریك نەکا به حاجی قادرەوه وەك خەریك دەبێ به پوڵ ڕۆینەوه؟ ڕۆین ومرۆڤی وەك ئەو هێنده خەڵقیان پێوه خەریکه لزووم بەوه نەهێڵێ کوردی قوڕبەسەر لوقمەی دەمی خۆیان بۆ بکا به خێر وسەدەقه. حاجی قادریش له گوێرەی نرخی ڕاستەقینەی خۆی ئەوەنده فەرامۆش کراوه که ببێته عەیب، ئەگەر نەڵێم توهمه، بۆ ئەدیبانی کوردو بەدوای ئەواندا بۆ هەموو میللەتی کورد.ئومێد دەکەم بۆت بەیان کەم لەم نووسینەدا حاجی قادر چەند پشت گۆێ خراوه...چەند نەناسراوه...واجیبی ناسین وڕێز لێگرتنی حاجی وئەمسالی حاجی وەك "فرض الکفایه"وایه تەرك کردنی دەبێته گوناه وجێی نەنگ وتەعنه بۆ هەموو کەس زانا بێ یا نەزان.دیاره ئەگەر ئەدیبانی کورد بەو واجیبه هەڵستن میللەتەکەش له عەیبی نان کوێری وکەمتەرخەمی ڕزگار دەبێ چونکه هەڵبەت ئەوانیش بەهۆی ئەدیبەکانەوه وله ڕێی بیستن ودیتن لەوانەوه ئاشنای حاجی وئەمسالی حاجی دەبن وگیانی میللیان به ناسینی ئەو ڕۆڵه دڵسۆزانەیان هێژاتر ودەوڵەمەندتر دەبێ. حەیفه شەوقی مەشخەڵی ئەدەب وخەباتی حاجی کزبێتەوه لەودیو پەردەی نەزانین ونەناسین.خۆ زیانێکیش بکەوێ بەهۆی ئەو نەناسینەوه لەخەڵقەکه دەکەوێ.حاجی به هەموو عومری به قەدەر دەنکی کونجی سوودی وەرنەگرت له کردەوەی خۆی.دوای مەرگی ئەگەر هەموو جیهانیشی بۆ بکەی به تەبەقه چێشتێك و لای قەبرەکەیەوه دای نێی لێوی لێ چەور ناکا. تازه فۆتانی ناو وشۆرەت وئەدەبی ناتوانێ زەرەر بەو بگەیەنێ ئەوێك که دەست له جیهان بریاو بوو.حاجی له حاڵی ژیانیدا تەمای به هیچ شتێك نەبوو بۆ شەخسی خۆی. هەموو ژیان و گیانی بۆ کوردوکوردستان بوو.دەبێ کوردوکوردستانیش هەندەی له باراندا ببێ ئەو ژیان وگیانه له بیر نەکا هەر نەبێ بۆ سوودی خۆی. دەوجا له ڕووی وەفاداری بۆ ڕۆحی حاجی وبه هیوای ئەوه سوودێك وەرگرین له ژیانی پڕ بەهای وبەو سوود وەرگرتنەمان ڕۆحی بحەسێنێتەوه،له ڕێبازێکی ڕاست وبێفێڵەوه کەئەوی لێ ڕازی بێ وله ڕاستی وسۆز وخۆبەختکردنی ئەو بوەشێتەوه ورده ورده پێ هەڵێنین وله مەڵبەندی منداڵیی حاجیەوه تێکەین با پەنایی وهەوراز ونشێوی عومریدا گوزەر کەین تا ئەو ئاسۆیه بەرزەی که دوا تیشکی ژیانی لێوه ئاوا بوو...دڵ نەگۆڕین بۆ هەوەس، خامه خوار نەکەینەوه بۆ مەبەس، شوعلەی حەقیقەت پەرستی تاکه چراییێك بێ شۆین هەنگاومانی پێ ڕوون کەینەوه،له ژێر دروشمی سۆز و پەرۆش بۆ دەرخستنی ڕاستی.

سەرچاوه:

حاجی قادری کۆیی، مەسعود محەمەد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٣.

# مرۆڤ و دەوروبەر

مەسعود محەمەد

لە بەرگی یەکەمی کتێبی حاجی قادری کۆیی کاتێك خەریکی توێژینەوە لەبارەی چەندوچونی گوێزانەوەی حاجی لە ژیانی لادێوە بۆ شارستان بووم، سەرەنجی خۆمو خوێنەرم بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشا کە دیوانی حاجی لە چاو دیوانی نالی دیاردەی گوڵو گیاو دەشتو دەری کەم ڕەنگە، هەر دەڵێی حاجی لە زوویێکەوە ژیانی دەشتو دەری بەجێ هێشتبێتو مەودای چەسپاندنی وێنەی ئەو ژیانەی لە دڵو بیرو فکری خۆیدا دەست نەکەوتبێت، بۆیە کە لە شیعری حاجی قادر هەر بایی دەنگدانەوەی گوڵو گیا لە شیعری شاعیرێکی شارستاندا گوێبیستی ئەو دەنگە دەبین، بە پێچەوانەی حاڵەتی دیاردەی گوڵو گیاو دەشتودەر لە شیعری نالیدا کەوا هەتا بڵێی دیاردەیەکی دەوڵەمەندو بە بنج ڕەسەنە، لەوە دەوەشێتەوە نالی سەرلەبەری ژیانی ساوایی‌و منداڵی خۆی لە نێوان گوڵو گیاو ئاژەڵی دەشتو دەردا ڕابواردبێت.

وەك دەبینیت، ئەم بە یەکدی گرتنەی دیوانی حاجی‌و نالی بایەخێکی زۆری داوە بە کارتێکردنی دەوروبەر لە دەروون‌و خەیاڵی شاعیر: لە ڕواڵەتدا وا ڕادەگەیەنێت کە شاعیر (یاخود مرۆڤ بە تێکڕایی) بەندەییێکی ملکەچە بۆ دەوروبەری ماددی، ئەو گوتەیەش بە ڕاست دەگێڕێ کە دەڵێ شاعیرو ئەدیبو هونەرمەند ((ئاوێنەی واقیع))ن. لێرەدا بە پێویستم زانی دەستی((ڤیتۆ))ی بیروباوەڕی خۆم لە ئاست ئەم بۆچوونە هەڵبڕم چونکە لە ڕاستیدا بۆچوونەکەی بەشێکی یەکجار گەورەی کاریگەرایەتیی ئادەمیزادی هەستیاری خاوەن ئیرادەو هۆش‌و صەدان تایبەتی سەر بە مرۆڤایەتی دەداتەوە بە ماددەی سارد‌و سڕی مردوو.

من کە دەڵێم دەستی ڤیتۆ هەڵدەبڕم، بە ڕواڵەت ناڕەزامەندی بەرانبەر گوتەی خۆم دەردەبڕم چونکە بۆچوونەکە هی خۆم بوو، بە یەکدی گرتنەکەش هەروەها: بەڵام لە واقیعدا ڤیتۆکە بەر خۆم ناکەوێت چونکە هەر ئێستاکە لەو ڕووپەڕانەی لێرە بە دواوە دەیانخوێنێتەوە ئەم ڕاستییەت بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئەوەی ڤیتۆی بەر دەکەوێت بەرەییێکی فرەوانی خاوەن لێکدانەوەو شیکردنەوەی ماددین کە هەر لەوانەوەو بیرکردنەوەیانەوە بە خێرایی گومانی کزکردنەوەی ((دەوری مرۆڤ)) لەو تەرزە بەیەکدی گرتنەی دیوانی حاجی‌و نالی دەکرێ، چونکە دەمێکە بە هۆی کەڵەکەکردنی ئەو بیروباوەڕەی دەوروبەر بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەکات زیهنی خەڵق ئامادە بوە بۆ ئەوەی هەموو جۆرە شیکردنەوەیەکی ماددی بداتەوە پاڵ بێدەسەڵاتی مرۆڤ و زاڵبوونی ماددە.

من لەگەڵ کە هیچ لاریم نییە لە گرنگی‌و بایەخی ماددەو دەوروبەرو هەڵکەوت‌و ڕووداو...هتد لە ژیانی مرۆڤ و بەرەو پێشچوونی کۆمەڵایەتی‌و بزوتنەوەی مێژوو و هەموو ئەو لایەنانەی پێوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە، دەمەوێ لەهەمانکاتدا بڕوای بێسنورو لەحەد بەدەر بە ((ماددە))و کاریگەرایەتی ماددە نەکێشێتەوە سەر دزینەوەی کاریگەرایەتی‌و خالقیەتی ((مرۆڤ)) بۆ ماددەکە دەزانین مرۆڤ سەرەڕای ماددەبوونی لەش‌و ئەندامەکانی، گیان‌و هۆش‌و ئیرادەشی هەیە کە ئەمانە لە ماددەی مردووو دەوروبەری شەختەکردوودا پەیدا نین، ئەمەش ڕاستییێکی هێندە سەرەتایی‌و بنجییە لە خوێندنەوەی دەفتەری کۆمەڵایەتیدا، ئەگەر تێ نەخوێندرێتەوە وەك ئەوە دەبێ کە بێ فێربوونی ئەلفو بێ بمانەوێ فێری خوێندنەوە ببین. من کەیفم بە ماددە دێت، خزمەتکاری ماددەو ئاغایەتی مرۆڤ بکات بە دەستوری کۆمەڵایەتی‌و مێژوو، هەرگیز ڕێ بە خۆم نادەم لە کەسیش ناسەلمێنم نەخشەکێشانی کۆمەڵایەتی‌و مێژوو لە ڕێی بیرکردنەوەی ماددییەوە بە شێوەیەك بێ ڕاستییان سەرەو بن بکات. دیاریشە گەورەترین سەرەو بن کردن لەم مەیدانەدا کڕنووشبردنە بە مرۆڤی زیندووی هەستیاری خاوەن ئیرادە بۆ بەر ماددەی ڕەق‌و تەق.

من لەم باسەدا بەوە دێتەوە کە دەبینم ئەو خاوەن بیروڕایانەی مرۆڤ بۆ ماددە نزم دەکەنەوە بە خۆیان دەڵێن مرۆڤدرۆستو ڕابەرو شۆڕشگێڕ. واشدەزانن داڕنینی بەرگی خالقیەتو داهێنەرایەتیو کاریگەرایەتی لە مرۆڤو بەخشینی ئەو بەرگە بە ماددە مردوو پتەوترکردنی بناغەی فەلسەفەی ماتیریالیستە کە هەر بەلای خودی خۆیانەوە بنەمای خێرو خۆشیو بەرەوپێش چوونی مرۆڤە.

بە ڕاستی ئەم تەرزە تێفکرینە وەك ئەوەیە کەیفمان بە بێهێزی چاوی مرۆڤ بێت بۆ خاتری بەرزبوونەوەی نرخی عەینەك. دەزانم ئەو خاوەن بیرانەی کە هێزی فەلسەفەی ماددی لە زاڵبوونی تەئسیری ماددە بەسەر مرۆڤدا دەبینن ناتوانن‌و ناشوێرن، بگرە بە خەیاڵیشیاندا نایەت عەینەكو چاوی مرۆڤ بخەنە دوو تای تەرازووی نرخاندن‌و بایەخپێدانەوە، چونکە دیارە لەم حاڵەتەدا بەیەکتر گرتنەکەو هەڵسەنگاندنەکە هێند ناقۆڵا و کاڵو کرچەو بە هیچ زەڕە تەئویلێکیش ناچێتەوە سەر حیسابی مرۆڤدۆستیو رابەرایەتیو شۆڕشگێڕایەتی، بەڵام ئەوانیش لە خۆیانەوە نەسەلمێنن، دەقی تیۆریەکەیان‌و راگەیاندنەکان‌و ئەنجامە فکرییەکانی ئەو تیۆرییە بە ناچاری دەمانبەنەوە بۆ لای زاڵکردنی عەینەك بەسەر چاودا، داننەهێنانی خاوەن تیۆریەکانیش بەو ئەنجامە ناقۆڵایە هەڵاتنێکی کۆڵدەرانە، بگرە ترسنۆکانەیە، لە ئاکامی ئەو پێشەکیانە ئەوان بە سەرچاوەی گەش‌و پڕ تەوژمی تیۆریەکەیانی دادەنێن: بیرباوەڕو فەلسەفەیێك کە لە سەرەتای ڕسکان‌و شیرازەهۆنبونیەوە پرشنگی بەڵێنەکانی ڕابەڕایەتیی خۆی بەرەو ڕووکارێك دەهاوێژێتو مژدەی چاکەو ڕاستیی ئەو ڕووکارەمان پێ دەدات، لێی ناسەلمێندرێت هەر جارە بە بەهانەیێك چاومان لە نەهاتنەدیی ئەو بەڵێنانەی بنوسێنێت یاخود خۆی بدزێتەوە لە ئاکامی ئەو پێشەکییە فکرییانەی هەڵی نابوون بۆ دەرخستنی ڕاستیو نهێنی شتان.

ئێمە لە مەیدانی فکرو فەلسەفەدا ئەو بەردەمەیە نین کە دامەزانان بە پێی فەندی یارییەکە جێگۆڕکێی پێ دەکەن بەردەکەش هەست بە خۆیو بە جێگۆڕکێیەکە ناکات. ئێمە مرۆڤین لە بیرمانە چیمان پێ گوتراوە، دواتریش کە لێمان داوا کرا مێشکی خۆمان داخەین لە ئاکامی چاوەڕوانکراوی ئەوەی گوتراوە دەبێ توند دەست لە هۆش‌و زانین‌و بیرکردنەوەمان گیر بکەین‌و ڕێ نەدەین لێمان بدزنەوە. هەروەها کە شتێك ڕووی دا دژی ئەو بەڵێنانەی پێمان ڕاگەیێندرابوو دەبێ لێی بپرسینەوەو نەشهێڵێن بە چاوبەستەکێو بەرگ تێهەڵکێشان زەردو سورو ڕەش‌و سپیمان لێ تێکەڵ بکەن‌و نوختەی ڕەخنەکەمان بە فەندی زارقەڵباڵغی تێ ببەن.

برناردشۆ لە ئامۆژگارییێکدا بە قوتابیی زانکۆکانی بەریتانیای گوت، ئاگادری خۆیان بن لەوەدا مامۆستاکانیان عەقڵیان لێ بستێنن‌و چ دەیانەوێ پێیان بسەلمێنن. ئێمە ئەگەر بتوانین وەیا بوێرین دەست لە هۆشی خۆمان گیر بکەین لە بەشێکی زۆری ئەو فڕوفێڵەی لێمان دەکرێت، ڕزگار دەبین، زۆر کەسیش لەوانەی بە هۆی گاڵتە بە هۆشی خەلقکردن دەبنە رابەری پەنجەنیشان وەك ئەو شێخەیان لێ بەسەر دێت کەوا کەرامەتەکانی بە درۆ دەخرێنەوە. هەروك کە شێخێکی تەریقەت خەبەری ڕابوونی قیامەتی لە ماوەییێکی نزیکدا بە خەڵق ڕاگەیاندو قیامەتیش دانەهات، دەبێ لە شێخایەتی بخرێتو تەئویل‌و بەهانەی لەو زڕە درۆیەدا لێ نەسەلمێنرێت، هەروەها کە خاوەن بیروباوەڕێکی فەلسەفی دەوری ((ماددە))ی زاڵ کرد بەسەر دەوری ((مرۆڤ))داو دواتر ویستی لە ئەنجامە ناقۆڵاکانی ئەو ڕایەی هەڵێت دەبێ توند یەخەی بگیرێتو ڕووبەڕووی ئەو ئەنجامە ناقۆڵایانە بکرێتو لەسەر خۆیو بیرو باوەڕەکەی حیساب بکرێت، من‌و تۆو خەلقی تریش لە بەندی قسە قەڵەوەکان‌و عەوام خەڵەتێنەکانی ڕەها ببین.

هەڵبەت خۆدانوساندنمان لەوەی خاوەن فەلسەفەکان دەیڵێن هەر لەو مەیدانە بەرتەسکەی ((پێشەکییو ئەنجام))ی نەزەریەکانیان کاریگەر نابێت، بەڵکو لە هەموو مەیدانەکانی کۆمەڵایەتیو بەرەوپێشچوون‌و خەیاتو هونەرو ئەدەب زانست و... هتد نەك هەر کاریگەر بگرە لە پێویستیش پێویستیترە، چونکە من‌و تۆو ئەوانەی پێڕەوی فەرمانی غەیرە دەکەین، بەڵگەی مرۆڤایەتیو ڕێز لەخۆنان‌و بەخۆنازینمان لەو هەڵوەستانەدایە کە تێیدا ئازادو ئازاین‌و بایی ڕازیبوون‌و ڕازینەبوون ئیرادەمان دەپارێزین. من هەر وەك ناڕاحەتن لەوەدا کە دەبینم ملیۆنانی خەڵق دەستبەستراوو بێئیرادەن لە ئاست ئەو مۆدیڵە جلکانەی کە مۆدەسازان بەسەر زەوق‌و باخەڵیاندا دەیانسەپێنن‌و وەك بوکەشوشە پەڕۆیان تێ دەئاڵێنن. وەهاو پتریش ناڕاحەت دەبم کە دەبینم ئاپۆرەی رۆشنبیران‌و شۆڕشگێران‌و خەباتکەران‌و ئەدیبان‌و هونەرکاران بە دەست خاوەن فەلسەفانەوە وەك قوڕەچەورە (طین صناعی)یان لێ دێتو هەر ساتە بە پێی ئاوازگۆڕی ئەو فەلسەفانە ئەوانیش کورتترو درێژترو پانترو باریکترو سورترو سپیتر و ((هەموشت))تر دەبنەوە لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر ناناسرێنەوە. من هەرگیز پێت ناڵێم قەناعەت بە هیچ کەس‌و هیچ شتێك مەهێنە، من دەڵێم حورمەتی ((قەناعەت))ت بگرە بەوەدا کە هەڵمەت ببەیتە سەر ئەو چەوتو چوێڕییەی لەو فەلسەفەیەدا دەیدۆزیتەوە کە کردوتە بە نێرتکی قەناعەتت... من دەڵێم مەبە بە دەروێشی فەلەسەفەی ئاخەلێوەی سەدەی بیستەم.

هەر ئەو زێدەپەرۆشەم بۆ قودسیەتی بیروباوەڕی ئازاد بوو گێڕاومیەوە سەر لێکدانەوەکەی خۆم تاکو گومانی کزکردنەوەی دەوری خالقیەتو خوازی مرۆڤی لێ بتەکێنمەوە.

ئەم تێبینییەی ترسی ((کزکردنەوەی دەوری مرۆڤ)) لەو بەیەکدیگرتنەی دیوانی حاجیو نالی یەکسەر قەڵەمی پێ هەڵەنگاوتم لە باسی حاجیو بایدامەوە لای ڕوونکردنەوەی ڕاستی مەسەلەی کارتێکردنو کارتێکرانی نێوانی مرۆڤ و ماددە بەو جۆرەی کە خۆم باوەڕی پێ دەکەم. کاتێك لەو ڕوونکردنەوەیە بومەوە دیتم دەوری ٨٠ لاپەڕەیێکی گرتۆتەوە، لەبەرئەمە ناچار بووم لە باسەکەی حاجی قادری دەربهاوێژم، بەڵام هەر لە کتێبەکەی حاجی قادری کۆییو لەژێر ناونیشانی ((لاباسێکی گرنگ)) لە لاپەڕە ١٥٦ەوە بە چەند لاپەڕەیێك چۆنیەتی مەسەلەکەم باسو نمونەیێکی نووسینەکەشم خستە بەرچاوی خوێنەرانەوە. لە کۆتاییشدا بەڵێنم دا زووبەزوو نوسینەکە بڵاو بکەمەوە بە مەرجێك "هیچ بەرهەڵستێکی لە خۆم بەهێزتر نەبێو دەستم بگرێ".

نوسینەکە هی سەرەتاکانی ١٩٧٢ـە بەڵام بەرگی یەکەمی کتێبەکەی حاجی قادری کۆیی لەبەر نەبوونی دەرفەتی لەچاپدانی دواخرا تاکو لە ڕۆژی ١٩٧٣/١١/٢٩ بە بۆنەی هەڵگرتنی پەردە لەسەر پەیکەری حاجی لە کۆیێ بڵاو کرایەوە. ئەوەی ((لاباسێکی گرنگ))یش ئیشارەی بۆ کرد مایەوە تا ئیمڕۆ، ڕێی بڵاوبوونەوەی بەر نەکەوتوە، ئێستاکەش کە بڵاودەبێتەوە نۆرەبڕی لە بەرگی چوارەمی کتێبی حاجی قادری کۆیی دەکات.

دەبێ بڵێم بەو دواییە کە هاتمە سەر پاکنوسکردنو ئامادەکردنی باسەکە بۆ لەچاپدان، بەپێی داخوازی ڕوونکردنەوەی بابەتی لێکدانەوە، ڕوداوو بەسەرهاتو وردە لێکۆڵینەوەی تازەشی تێ کەوتوە، ناوناوە بیروباوەڕی دیکەشم تێ چێن کردوە کە هەر هی خۆم بوون بەڵام ڕێکەوت دەرفەتی دەربڕینیانی نەدابومێ، ئەم هۆیانە وایان کرد نوسینەکە لەبەر یەك بکشێتەوەو گەلێك پتر لە ٨٠ لاپەڕە پڕ بکاتەوە هەرچەند بەشێکی کەمی لێکدانەوەو بڕواو بیروڕاو فکری خۆمم لە مەیدانی گوریس کێشەکێی ((ماددەو مرۆڤ–سروشتو هۆش)) خستۆتە نێو ئامێزی ئەو لاپەڕانەوە.

وا بە باش دەزانم بۆ پتر ڕوونکردنەوەی سەرچاوەی ئەو بابەتەی کەوتە عینوانی ((لاباسێکی گرنگ)) چەند لاپەڕەیێکی بەرگی یەکەمی کتێبی حاجی قادری کۆیی کە پێوەندی بە کردنەوەی دەرگەی ئەو لاباسەوە هەیە لێرەدا بنوسمەوە ئەوجا یەکسەر لاباسەکەی بە دوادا بنوسم.

لە پاش لێکۆڵینەوە لە جێگەو ساڵی هاتنە دنیای حاجی قادر، دێمە سەر لێکدانەوەیێکی یەکجار تایبەتی خۆمو بەدوری لێکۆڵینەکەوە. ئەو لێکدانەوەیە لە سەرەتاکانی لاپەڕە ١٤٩ی کتێبەکەوە دەست پێ دەکات بەم شێوەیەی وا لێرەدا بۆ خوێنەری دەنوسمەوە:

((ئەمانەی خستمنە بەرچاوی خوێنەر سەرجوملەی گوتەو بیروڕای جیاجیایە دەربارەی ساڵو جێگەی لەدایکبوونو کاتی هاتنی حاجی قادر بۆ کۆیێ. قسەیێکی تایبەتی خۆم ماوە، وەك تێبینی، لەبارەی ئەو ساڵەی هاتنی حاجی بۆ کۆیێ، لە پێشتر ئیشارەم بۆ کردو ناوم نا بەڵگەی زیهنی. قسەکەم لە بنەڕەتدا لەسەر تەواتور هەڵ دەستێ بەڵام بەڵگەکەی زیهنی، وەك دارەکاژ، باڵای لەرزۆکی ئەم قسەیەم ڕاست ڕادەگرێ: دیمەنێکی کەمڕەنگی سپیپات وەك زڕەخەون یاخود وڕینەی تادار کە هەیەو نییە... دەدیترێو نادیترێ، لە بەراوردکردنی دیوانەکەی حاجی لەگەڵ هی نالیدا دێتە پێش چاوێکی تارمایی بین وەیا هەستی زامی کول. دیمەنەکە ئەمەیە:

وەك بڵێی نالی لە سەرەتای عومریەوە تا ماوەیەکی ئەوتۆ فرچکی گرتبێ بە ((لادێیی))هەر لە شارەزورو ((خاكو خۆڵ))و دەشتودەر بوەو لە دەستووراتی فەلاحەتدا قاڵ بۆتەوەو کەینو بەینی شۆبڕینو وەرددانەوەو تۆو کردنو دورێنەو خەرماندانانو هەڵگرتنو هەموو کاروبارێکی کشتوکاڵی لێ بوە بە ((سروشتی مکتسب))و ناوی گژو گیاو گوڵ گوڵاڵەی بۆ بوە بە فەرهەنگی سەرەتایی گڕوگاڵی منداڵەتی، وێنەی ژیانو ئەحواڵو ڕوخساری دەرو دەشت لە ڕووپەڕەی زیهنو هەستی بوە بە نەقشی هەڵکەنراو. دەبێ بۆیە بێ، لە زۆر شوێنی دیوانەکەیدا چاندنی دانەوێڵەو وەردو شۆو ئاژەڵو گوڵو گیا وا دەبریقێنەوە هەر دەڵێی تریفەی مرواریو گەوهەرە کە لە ڕشتەییێکدا وەستاییێکی شارەزاو پسپۆڕ هۆنیبێتیەوە. وتوێژی نالی لەگەڵ دەشتو دەرو گیاو گوڵو ئاژەڵدا لە هی مرۆڤێکی لادێیی ئازموودە دەکا نەك بوێژێکی خەیاڵباز. لەگەڵ مندا سەرەنج بدە دەوری ((چەڵتووك)) لەو دوو بەیتەدا:

بەحری غەزەلی پڕ لە دوڕو گەوهەرە ئەمما
غەوواسی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە
پڕ دانەیە ئەمما نەوەکوو دانەیی چەڵتووك
بەحرم گوتوە نەك وەکو گۆلی مەرەزانە

لێرە بە دواوە لاپەڕەکانی ١٥١، ١٥٢، ١٥٣ نموونەی ئەوتۆ لە شیعری نالی نیشان دەدەن، کە زۆر لە نزیکەوە خەریکی ژیانی دەشتو دەرو وەسفی گوڵو گیاو ئاژەڵە، تاکو لە دێڕی کۆتایی

لاپەڕە ١٥٣ لێکدانەوەکە دەست پێ دەکاتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە.

((لەو شیعرانەو گەلێ شوێنی دیکەدا نالی کە ناوی گوڵو دارو درەخت دێنێ ئەو شاعیرە نییە لە قاموسو کتێبان ناوی دیتوون یا لە خەڵقی گوێبیستیان بوە... نەخێر کابراییێکی دەشتەکی ئەوتۆیە سەدانجار دەستەی لێ بەستونو لەسەریان نوستوەو ئەمدیو و ئەودیوی کردون. بە ئاسانی نایەتە مێشکی بوێژەوە تەشبیهی زمان بکا بە ((سووسنی تەڕو پاراو)) یاخود دوو چاوی خێلێك، یەکیان بە ((نەشکوفتەی وەنەوشە))و ئەوی دییان بە ((نەیلووفەڕ)) دابنێ، یاخو بەو هەمو دەسەڵاتو دیققەتکارییەوە ((زارو زبانو ددانو پووك)) بکا بە وێنەی ناو ئاوێنە کە لە غونچەیەکی شەونم لێنیشتوو دوبارە ببێتەوە، دەمەوێ بڵێم سەرەڕای دەسەڵاتی شاعیریو هەستی تیژو فیکری ورد دەبێ ((لەگەڵداژیان– معاشره)) یش یارمەتی نالی دابێ بۆ ئەو هەموو ئیعجازکارییە لە عاست گوڵو گیاو درەختداو هەر بۆیەش ئەوەندە خۆیان دە شیعری هاویشتبێ)).

((ئەم زاهیرەیەی ((نباتی)) بە هەردو ڕووی ((چەندو چۆن))یەوە لە دیوانی حاجی قادردا خۆ نانوێنێ. بەڵێ گوڵو گیاو میوەو دەشتو دەر لە شیعری هەموو شاعیرێکدا هەیە، بەڵام هەبوونی تێ هەڵەنگووتن وەیا بە دوادا گەڕانو خۆ پێوە ماندوو کردن یەکجار جیاوازە لە هەبونی ((زگماك))ێکی ئاسایی کە دەڵێی پارچەیێکە لە سروشتو دەرونی شاعیر، بە ڕادەی ئەوە کە شاعیر لە نزیکەوە ڕەفاقەتی کردبن ناوهێنانو بەکارهێنان بۆ دەربڕینی واتاو نەخشەکێشان وەستایانەتر دەبێ. هەڵبەت ئەو ڕەفاقەتە تاکو لە سەرەتای ژیانی شاعیرەوە بێ پتر فرچکی پێوە دەگرێو لە گیانو میزاجی جێگیرتر دەبێ. بۆیە من وا دەزانم نالی پلەی منداڵیو ساوایی خۆی لە دێی ((خاكو خۆڵ))و دەشتودەرو نێو گیاوگوڵو ئاژەڵدا ڕابواردبێ.

بەو پێیەو لە ڕێی قیاسی ((مفهوم المخالفه))وە دەبێ کزیو کەمی زاهیرەی ((نباتی)) لە دیوانی حاجی قادردا لەوەو هاتبێ کە حاجی بە ساوایی وەیا لە سەرەتاکانی منداڵیدا لە لادێ ڕای نەبواردبێ. کەواتە دەگەم بەو ئەنجامە کە ئەگەر حاجی قادر وەلادەتیشی لە کۆیێ نەبووبێ دەبێ لە زوییێکەوە واتا هەر لە ساواییەوە لادێی بەجێ هێشتبێو هاتبێتە کۆیێ. ڕواڵەتی بەیەکدی گرتنی دیوانەکەی لەگەڵ هی نالی وا ڕادەگەیەنێ کە ئەم ڕەفاقەتەی سەرەتای ژیان لەگەڵ شیناوردو گوڵو درەخت دەشتو دەردا بۆ حاجی ڕێك نەکەوتوە، بۆیەیە ئاشنایی ئەو لەگەڵیاندا هەر بە قەدەر ئاشنایی شاعیرێکی شارستانی بوە. بەڵام هەمان حاجی قادر، چونکە چەند ساڵێکی خوێندنی فەقیەتی لە نێو عەشیرەتو ڕەوەندو لەگەڵ ڕەشماڵو مەڕوماڵاتدا ڕابواردوەو لە چەند بەهارێکدا خۆی لە هەوارەکانی لاجانو باڵەکەتیو دەوروبەری سابلاغو بێتوش دیتوەو لە تەفسیلاتی ژیانی کۆچەریو مەڕداریو گاڕان بەخێوکردنو خێمەنشینی شارەزا بوە بۆیە بەو هەموو دەسەڵاتی ((تعبیرو تصویر))ە لە بەهارییەکەیدا وێنەیێکی لە سەدی سەدو ڕەسامانەی ژیانی نێو ڕەشماڵو گژە گژی داکردنی ئاژەڵو بێچوو تێبەردانو هەموو کەینو بەینی کۆچەری وەك تابلۆی زەیتی ئارایش دەداو بەهارو عێلەجاتو سەگو کەحێلو مەڕو ماڵو بارانو هەورە تریشقەو پەڕەوڵی تاقی ئاسمانو هەموو بارێکی ئەو کارەمان بە چاوقوچێنێك بۆ دەخاتەوە سەر یەك. تۆ بڵێی ئەگەر بە چاوی خۆی ئەو جۆرە ژیانەو تێکهەڵقژانەو هەڵسووڕو داسووڕەی نەدیتبا بیتوانیبایە لە نەخشەکێشانیدا هێندە خامەڕەگنینو شیرنکار بووبا؟))

((جارێکی دیکەش سەرنج بگرە لە وەسفی بیابانو ڕەملو دڕکو داری ڕێی حیجاز کە نالی لە چەند قەسیدەیێکی ((مناجاة))دا بەرەو حەج لە کانیاوی دڵی خۆی هەڵی هێنجاون. نە نالی دەیتوانی لە غەیبەوە ئەو وەسفە ئەفسوناوییەی سەحرا بکا، نە هیچ وەسفێکی وا لە سەرانسەری دیوانی حاجی یا غەیری حاجی کە دیمەنەکەی نەدیتبێ وجوودی هەیە. ئەو وێنەگرییەی نالی کردویەتی لە دەسەڵاتی تاك تاکە شاعیری هەڵکەوتوو نییە با چووبێتە حەجیش، چ جایی ئەوەی شاعیری حەجنەکردوو و سەحرا نەدیتوو بتوانێ هەیبێ)).

((ئا ئەم تێبینیانە وا دەکەن من ئەو تەواتورە پەسەند بکەم کە دەڵێ حاجی لە منداڵییێکی زوەوە، یاخود بە ساوایی، هاتۆتە کۆیێو لەوێ چاوی پشکووتوەو خوێندنی سەرەتایی دەست پێکردوە تا بوە بە فەقێیەکی فراژوو لە خوێندندا. نەبیستراوە لە گەشەکەی باڵەکەتیو کوردستانی ئێرانی بە پێشەوە لە کۆیێ چووبێتە دەرێ بۆ خوێندن)).

لێرە بە دواوە دەگەینە ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە لە کۆتایی لاپەڕە ١٥٦ی بەرگی یەکەمی حاجی قادری کۆیی ئیشارەتی بۆ کراو لە لاپەڕە ((١٥٨))یش نموونەی لێ وەرگیرا، بەڵام دیسان دەڵێمەوە چی ئێستاکە بە چاپ دەگات بەر فرەوانترە لەوەی کاتی خۆی نوسیبوم، سەرەڕای بەرفرەوانی باسی هەڵکەوتو ڕووداوی ئەوتۆشی تێدایە کە لە کاتی دەستپێکردنو لێبوونەوە لە نووسینەکە جارێ ڕوویان نەدابوو.

لێرەشدا حەزم بەوە کرد کە نووسینەکەم ئەو عینوانە وەك سایەبان بەسەر خۆیەوە بگرێت کە لە سەرەتاوە بە سەریەوە بوو، بۆیەش پتر لەو عینوانە کۆنە ڕازیم چونکە ساڵبەساڵ ڕوداوو ئەزمون ڕاستبوونی بۆچوونەکانم، چ لەو لێکدانەوەیەدا بێت چ لە سەرلەبەری سێ بەرگەکەی حاجی قادری کۆیی دا بێت، بە ئیسپات دەگەیەنێ: بە نیازی تاقیکردنەوەی قسەکانم بگەڕێوە بۆ لاپەڕەکانی ٢٤، ٢٥، ٢٦ی بەرگی یەکەمی حاجی قادری کۆیی، ئازادیشی لەوەدا هەر لاپەڕەو قسەیێکی دیکەم لەو نووسینانەدا بخەیتە بەر تاقیکردنەوەوە...

بەم هەستەی ڕازیبوونم لەوەی چەند بەینێکە نوسیومە بانگ هێشتنت دەکەم و بۆ خوێندنەوەو دوبارە ئەزموونی:

**((لاباسێکی گرنگ))**

لێرەدا پێویست دەبینم نەختێك سەرگوزەشتی حاجی قادر بە دیار لاباسێکەوە ڕابگرم بۆئەوەی ئەم بەراوردکردنەی لایەنی دیاردەی ((نباتی)) لە شیعری نالی و حاجیدا بەو شێوە سەرپێییەی پێیدا تێپەڕێم بەرەو خلیسکی فیکری و فەلسەفیمانەوە نەبات. ئەم تەرزە هەڵوەستە لە منەوە بۆ ڕەواندنەوەی تۆزو تەم و تاریکایی بە دەوری نوسینەکەمەوە پێداویستێکە ڕاستەوخۆ لە گرتنە ئەستۆی ئەرکی نوسینەکەوە سەرهەڵدەدات چونکە یەکەم مەبەست لە نوسینی دڵسۆزانە سودی مرۆڤە چ لە ئێستاکەو چ لە دواڕۆژدا بێت. دیارە مرۆڤی لێرە بەپێشەوە لەدەست سوودو زیان و خۆشی و ناخۆشی و کەم زۆری دەرچوون پێوەندییێکی ئەوان بەو شتانەوە مابێت هەر ئەوەیە ئێمە کەسانی دوای ئێمە لە بەسەرکردنەوەی ژیان و خەبات و چاکەی ڕووت بوە، بەهۆی نەفەسکورتی و کەم و کەسری نوسینەکەی من سەر بکێشێتەوە بۆ بە سەهوبردنی خوێنەر. لە خۆشم ناسەلمێنم ترسی دڵڕەنجاندنی ئەم و ئەو بکەم بە بەهانەی خامۆشبوون. من ئەگەر ئەو ترسنۆکە سڵکردوە بم کە لە ڕەخنەو توانج و سەرکۆنەو دژایەتی مێشك و شکان هەڵبێم چ ڕەوای هەق بوو لە سەرەتاوە دەست بۆ قەڵەم درێژ بکەم؟ کێ یەخەی گرتبووم بە دەنگ بێم؟ ئەوەی ڕاستی بێ من تا ڕادەی شەیدابوون حەز لە پوچاندنەوەی هەڵەی پەرەسەندوو دەکەم، لەبەرئەمە زۆر زەحمەتە خاتران و کۆمە کردن و تێبینی دڵی ئەم و ئەو شتێکم پێ بنوسێت کە بە ڕاستی نازانم... بەڵێ هەموکەس قسەی وەها دەکەن، وا منیش کردم، بەڵام با خوێنەر بەرەوان بێت لەوەدا ئایا چەند کەس قسەی زاریان و هەڵوەستی ڕاستەقینەیان وەك یەکە..!!

با لێرەدا شتێکی دیکەش بخەمە سەر ئەم قسانەم:

من وەکو ئەو نوسەرە ((ملتزم))ـەی سەر بە لایەنی فەلسەفەی وە یا سیاسەتی قەرارداده نیم کە قەناعەتی پێشەکی لایەنە باوەڕ پێکراوەکەی بەسەر خۆیدا هێناوەو بە پێی بۆچوونی کەسانی لە خۆی بەرەژوورتر دەڵێ و دەکات و دەنووسێت پتر لەوەی گوێ بداتە واقیع و ڕووداوو ڕاستی و ناڕاستی شتان. قەناعەتی من وەك قەناعەتی هەر کەسێکی دیکەی زاڵ بەسەر دڵ و مێشك و دەست و زمانی خۆیدا، لە ناخی دڵ و دەروون لە ئاکامی لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەی سەربەخۆو ئازادی خاوەنەکی پەیدا بوە، هەر بۆیەشە ئیمکان هەیە ئەوەی بە ئازادی قەناعەتی لە دڵی خۆیدا پەیدا کردوە بە ئاسانی واز لە هەڵەی خۆی بهێنێت، چونکە کە حەقیقەتی لێ ڕوون بۆوە چاوەنۆڕی ڕازیبوون و ڕالێبوونی دەسەڵاتی سەرەوەی خۆی ناکات بۆئەوەی بڕوا بکات بە ڕەوابونی گۆڕینی قەناعەت. ئەوانەی بە عادەت ناوی ((ملتزم)) لەخۆیان دەنێن ناتوانن دان بە ڕاستبوونی شتاندا بهێنن بەرلەوەی فەتوای ئەو ڕاستییە لە دەسەڵاتی سەروی خۆیەوە دەرنەچێت. دیارە مرۆڤی لاتەریکی وەك من لەوانە نیم، چونکە ئەرکی من چاوەنۆڕی فەتوا ناکات، بڕیاری پێشەکیم پێ نادات بە ڕاستی و چەوتیی شتان، ڕێگەشم پێ لە تۆژینەوەی ئازاد نابڕێتەوە، شاڵڵا ئەو تۆژینەوەیە بیروباوەڕی هەموو دنیای سەرەوژێر دەکرد، چونکە لە حیسابی مندا هیچ تەرازوییێك بە دەرکەوتنی ڕاستی شرایەوە دانالەنگێت، قۆنتەراتیشم نەگرتوە لەسەر ڕاستبونی ئەو شتانەی باوەڕیان پێ دەکەن تا ئەگەر هەڵەی یەکێکیان دەرکەوت نەختێکی سوودی قۆنتەراتەکەم لێ کەم بکرێتەوە وەك کە ((ملتزم))ە فەلسەفیەکە بە دوو پیتی نەگونجاو لەگەڵ فەلسەفە بە ((التزام)) گیراوەکەی ڕیزپەڕ دەبێت و ناوی لە لیستەدا ڕەش دەبێتەوە.

من ((التزام))م لەگەڵ خۆمدا هەیە نەك لەگەڵ دەرەوەی وجوودم، خۆشم دوولایەن نیم، یەکیان پارەی ((التزام)) لەوی تریان داشکێنێت، چەند بە ئاسانی لە تینوەتیدا ئاو دەخۆمەوە هەروەهاش بە ئاسانی واز لەو باوەڕەم دەهێنم کە بە بەڵگە دەپوچێتەوە با بە هەموو عومریشم ڕێزم لێی گرتبێ. من یەکەم ئامۆژگاریم بۆ ڕۆشنبیری تازەپێگەیشتووی کورد ئەوەیە خۆی نەکاتە پاسەوانی فکرەی قاڵببەستوو... چاوی ڕەخنەی نەنوقێنێ.. هەردەم ئامادەی ((ڕەفز)) بێت بە مەرجێك سەرلەنوێ نەبێتەوە پاسەوانی ڕەفز.

بوتپەرستی چ لە چەپ و چ لە ناوەند بێ چ لە ڕاست هەر بوت- پەرستییە، فکرەش بەوە چاك و خراپ نابێت داوای ((چەپایەتی و

ڕاستایەتی)) بکات. فکرەی خراپ بەوە چاك نابێت بەرەییێکی چەپڕەو بیکەن بە ئایینی خۆیان، فکرەی چاکیش بەوەندە خراپ نابێت چەپڕەوەکان بیکەن بە توهمەو لە ملی ڕاسترەوەکانی بپێچن. فکرە ئەگەر خراپ بێ هەر خراپەو بەند نییە بە چەپو ڕاستەوە. ناشێ فەلسەفەو بیروباوەڕ قاڵبی سۆفیگەریی‌و دەروێشایەتی وەرگرێت، تا لایەنی ((ماددییەت))یش لە فەلسەفەدا بەهێزتر بێ پتر پێویستی هەیە بە نەرم‌و شلی‌و بەرفرەوانی باخەڵ فەراحی، چونکە فەلسەفەی ماددی لەسەر بنکەییێکی ڕەق کە ماددەیە ڕەگ دادەکوتێ بەتەمایشە تەفسیری هەمو شتێك بکات بە ماددەو مەعناوە. بە نمونە دەڵێم سۆزی دایك بۆ بێچوەکەی درەنگتر خۆی بەدەست تەفسیری ماددی تەسکبینەوە دەدات لەو تەفاعولە کیمیاییەی کە بەپێی دەستوری ماددی ڕەق‌وزەق پێکدێت، کەچی کابرایەکی ((مثالی)) غەیبپەرست زۆر بەئاسانی دەتوانێ بڵێ ئەم سۆزە مەعنەوییە لەم مریشکە نەزانەوە بۆ ئەو جوجەڵانەی کە دوای دوو مانگی تر لە خۆیان دەکاتەوە بەهرەییێکی خوداییەو لەگەڵ حیکمەتی بێپایانیدا گونجاوە بە قەدەر گونجانی تەفاعولی کیمیایی لەگەڵ ئەو حیکمەتەدا.

زۆر بە داخەوە، ئاغلەب وا دەبێ بیرکەرەوەی ماددی ئینکاری ئەو شتە مەعنەوییانە دەکات کە لەگەڵ ڕاستەحیسابی فەلسەفە ماددییەکەیدا ناگونجێت، ئینکار کردنەکەش هەر بە زەرەری ئەو قوتابیانە تەواو دەبێت کە وەك سۆفی‌و دەروێش چاویان ئەبڵەق بوە بەرانبەر وشە گەوهەرینەکانی ئەوەوە. فەلسەفەی ماددی کە هات‌و بنگەو سەرشاری خۆی تەسك کردەوە لە پێناو پاراستنی ئابڕووی خۆی، وەها ((محدود)) دەبێ کە بە هیچ لێکدانەوەییێکی نیمچە ژیرانەش بایی ئەم جیهانە نا مەحدودە ناکات.

فەلسەفەی تەسك یا دەبێ لە ئاست تەفسیری ((بوونەوەر)) هەڵێت‌و کۆڵ بدات، یا دەبێ جیهان تەسك بکاتەوە بۆ ناو قاڵبەکەی خۆی، واش دەزانم ئەو ڕۆژگارانە فەرمانی ((محاکم تفتیش))و ئۆردوگای عەمەلی سوخرەی سیبریایان تێدا ڕێز لێ گیراوبوو خەریکن لە ئاسۆی بەسەرچوون‌و بڕانەوەوە ئاودیوۆی نەمان دەبن. لێرەدا کە دەڵێم دەبێ فکری ماددی خۆی لەبەریەك بکێشێتەوە بۆئەوەی بتوانی تەفسیری دیاردەی ناماددی وەکوو ((سۆزی مریشك بۆ جوجەڵەکانی)) بکات وەك کە بابای غەیبپەرست بە ئاسانی‌و بێ ئەوەی ((تناقض)) لە باوەڕەکەی خۆیدا بکات دیاردەکەی گێڕایەوە بۆ حیکمەتی خوا.

لێرەدا هەرگیز مەبەستم ئەوە نییە بڵێم بیرکەرەوەی ماددی واز لە باوەڕی خۆی بهێنێت‌و ببێتە خوداپەرست، خۆ ئەگەر ئەمەش بکات پەکی لایەنی ماددی بیروڕایەکەی ناکەوێت چونکە خوا-پەرستەکانیش باوەڕیان بە دەستورەکانی ماددی هەیەو فڕۆك لێ دەخوڕن‌و شرنقە لە نەخۆش دەدەن‌و باراش بۆ ئاشی ئاگر دەبەن... مەبەستی من ئەوە نییە شتێکی ترە: من دەڵێم ((دواتریش بە چاکی خۆم ڕوون دەکەمەوە)) خۆلکاندن بە تەفسیری ماددی ڕەق‌و تەق تا ئەو ڕادەیەی مرۆڤ سڵ بکاتەوە لەوەی تەفسیری ((سۆزی مریشك)) بە شتێکی جودا دابنێت لە تەفسیری پێکهاتنی ئاو لە ئۆکسجین‌و هایدرۆجین، کە دەشزانین تا بڵێی لە یەکتر جودان، سەر دەکێشێتەوە بۆئەوەی بڵێین دابڕینی گلاسێك ئاو لە کوپەییێك ئاو عەمەلیەتێکی ماددییە وەك لێکردنەوەی سەری مریشك لە لەشەکەی.. ئەمیشیان دیسان وەك بڕینەوەی دەست‌و قاچی مرۆڤە بە مشار، هەموویان هەر عەمەلیەتی ماددین.

ئەم ئەنجامە سەیرە ڕاستەوخۆ لە سەپاندنی یەك تەفسیری ماددی بەسەر ((ئاو- مریشك- مرۆڤ))- ((مردوو- زیندوو- هۆشدار)) پەیدا دەبێت، هیچ لە کابرای ماددیش ناسەلمێندرێ لەم ئەنجامە سەیرەی بڕیارە پێشەکیەکەی خۆی هەڵێت بەوەدا بڵێ من کە سۆزی مریشك‌و پێکهاتنی ئاوم گێڕایەوە بۆ تەفسیری ماددی مەبەستم ئەوە نەبوو لە دواییدا بڵێم سەربڕینی مریشك‌و دابڕینی پەرداغە ئاو وەك یەکن، چونکە ئەگەر ئەمەی لێ بەسەلمێنین ڕێی پێ دەدەین فێڵمان لێ بکات. دەبێ لێی داوا بکەین لە سەرەتای هەڵنانی فەلسەفە ماددییەکەیدا فەرقی مردو و زیندو و هۆشدار بکات تاکو دواتر لێی بسەلمێنین کە دابڕینی ئاوو سەربڕینی مریشك‌و دەستبڕینی مرۆڤ بە پێی فەلسەفەکەی ئەویش شتی لەیەکتر جودان. دەبێ فەلەسەفەکە لە سەرەتاوە ئەوەندە بنگەی لێکدانەوەو تەفسیری تێدا هەبێت کە بایی مامڵەتکردن لەگەڵ ملیۆنەها شتی لەیەکتر نەچوو بکات، نەك هەر جارە کە هات‌و کەلێنێکی تێکەوت‌و شت بەو کەلێنەدا تێپەڕی‌و بەر تەفسیرەکەی نەکەوت قوڕێکی تازەکردی ((فکری ماددی)) بهێنێت‌و کەلێنەکەی پێ پڕ بکاتەوەو بشڵێ فەرمون سەیری فەلسەفەکەم بکەن چەند ڕاست‌و تەواوە.

ئێمە ئەگەر ئەو پینەچیەتیە لە بیروباوەڕوو فەلسەفەییێکی تریش بسەلمێنین، با ئەو فەلسەفەیە جنۆکەپەرستن بێت، بەرانبەری دەمکوت‌و دەستەوسان دەبین، چونکە لە هەمو پەککەوتنێکدا تەکانێکی نوێ دەداتە خۆی‌و لە قۆرتەکە دەردێت. چ فکری ماددی بێت‌و چ هەر فکرێکی دیکە بێت، لە پێشەکیەکانی‌و لە بنکە بنچییەکانییەوە تەواوی‌و ناتەواویەکەی دەردەکەوێت، نەك فەند‌و فێڵی پینەچییانەی دوا-کاتیەوە. ئەگەر ئەم مەرجەی ((تەواویی‌و دروستیی لە سەرەتاوە)) نەکەین بە پێوانەی دۆزینەوەی ڕاستی‌و

دروستیی باوەڕان ناتوانین بە هیچ باوەڕێك بڵێین ناتەواو وەیا هەڵەیە. بە نمونەییێکی سەرپێیی دەڵێم، بابایەك کە گوتی "کێ دەیەوێ دە هەزار دیناری بدەمێ؟" دەبێ دە هەزار دینارەکەی هەبێ، یاخود هەر نەبێ خێرا پێی پەیدا بکرێ، دەنا ئەویش دەتوانێ بەڵێنەکە بدات و کە پارەکەی لێ داوا کرا بڵێ لێم ڕاوەستێ بۆتانی پەیدا دەکەم.

بێ هەموو نیازێکی تایبەتی بە هەڵە دەرخستنی هیچ یەکێك لە بیروباوەڕو فەلسەفە جوداکانی ئەم جیهانە دەڵێم فەلسەفەی تەسك و دنیای بەرین دوولایەنی یەکجار پێچەوانەی "معادلەی فکری"ن، ناشکرێ لە قەپێکی کەللەسەری مرۆڤدا جێیان بۆ بکرێتەوە مەگەر بە زەبری قەمچی و زمان بڕین و بەندیخانە وەیا دڵدانەوەو دەم چەورکردن...

تۆ دەزانیت و منیش دەزانم "منطلق"و "أزل و أبد"و نهێنیەکانی سروشت و ماددی زیندوو و هۆشیارو دیاردەی خواز "ارادە"و خەسڵەتەکانی تری ڕوەك و گیانلەبەرو مرۆڤ ...و پرسیارەکانی نیسبی و فەلەك و ئەسڵی مادەو هەستی شەشەم و حەوتەم و صەدان و هەزاران هەزاری باسی ئەوتۆیی، خەیاڵی بێسنوورو وڕینەی بەربەڕەڵلاو خەونی ڕەها تێیان بڕ ناکات مەگەر ترسی هێڕبوون و سەرسووڕان و گێژان پەراوێزی دەسکردیان بە دەورەوە هەڵنێت و مەودایان کورت بکاتەوە، ئەگەرنا جیهان و پرسیارەکانی بێسنوورن... نامەحدوودن، دیاریشە پێوانی ئەو نامەحدوودانە بە عەیارەی مەحدوود گەپێکی سافیلکانەیە، کە بتەوێ بزانێ دەریا چەند دەولکە ئاوی تێدایە، یا دەبی دەریاکە بچووك بکەیتەوە بۆ دەسەڵاتی دەولکە، یا دەبێ دەولکەکەت ئەوەندە زل بێ بۆ پێوانی دەریا دەست بدات، یا واز لە پێوانی دەریا بهێنێت: ئەوەندەی زانیبێتیشم کەس وازی لە دەریاپێوان نەهێناوە تا ئەوەی بە ئەنگوستیلەی درومانیش ئاوی لێ هەڵێنجابێت... هەموو خاوەنێکی دەولکەی فکری تەسك بە زمان و بە قەڵەم وایان ڕانواندوە کە دەولکەیان بەشی دەریای تریش دەکات. زۆریشیان لەوانەن دوای هەڵێنجانی چەند دەولکەییێك دەڵێن لە پێوانەی دەریاکان بووینەوە، جا ئەگەر دەسەڵاتێکی دنیاییان لە پشتەوە بوو وەیا هێزێکی ئایدۆلۆجی دڵ خۆشکەرەوە لە ڕاگەیاندنەکانیاندا هەبوو خەڵکێکی زۆریان بەدوا دەکەوێت، بە چاوی خۆشمان دەبینین فەلسەفە مادییەکان بەهەشتێکی سەر ئەرزی وەك بەهەشتی دینە ئاسمانیەکان دەکەن بە ڕاکێشەری مەردم بۆ ناو باوەشی خۆیان کە بەهەشتیش دروست نەبوو چاو لێ زەقکردنەوە کاری خۆی دەکات.

ئەم پێشەکیانە کە وەك وتووێژێکی دەروونی نووسەرو ئاخێوەر (لێرەدا من ئەو نووسەرو ئاخێوەرەم) خۆ دەنوێنن بە بەریانەوە هەیە گەلێك شریتەی تر بە دەوری خۆیانەوە بهاوێژن هەمووشیان لە جغزی ڕەهایی فکر و پوچاندنەوەی قاڵب بەستن و شەختەکردنی فەلسەفەدا گەپرۆکە ببەستن، چونکە هەم ڕەهایی فیکر بێسنوورە هەم قاڵببەستنی فەلسەفانەیش، وەك بە چاوی خۆمان دەیانبینین، دیاردەییێکی بەرچاوو پەرەسەندوە. نە کۆتاییهێنان هەڵدەگرێ و نە هیچ ئەرکێك و درێژە پێدانیشی لێ خەسارە، تەنانەت بە نیسبەت زۆربەی خوێندەواری نەوباوی کوردەوە کوتانەوەی بیروڕای لێرە بە پێشەوە باسکراویش، بە تایبەتی ئەوەی ڕەخنە لەلایەنی (یۆتۆپیا)ی فەلسەفەی ماددی دەگرێت، هەر زۆر بەسوودە چونکە بەداخەوە سی ساڵ پترە خوێندەواری کورد هەرچی فکرێکی دەرەوەی جغزی ماتیریالیزم هەیە لێی حەرام کراوە.

خوێندەواری کورد هەر ئەوەندە چاوی بە فەلسەفەییێکی جودا لە ماتیریالیزم دەکەوێ کە نوسەری ماتیریالیست لە نوسینی خۆیداو بە مەبەستی پتەوکردنی بنەمای فەلسەفەی ماددی باس لە فەلسەفەی تر دەکات و بەدرۆیان دەخاتەوەو لەپاڵ یەکیان هەڵدەوشێنێت وەك ئەوەی کە ئیماندارێك دێت و باسی زەندیق و کافرو بێئیمانان دەکات و سەرلەبەری بیروباوەڕەکانیان و ئاکارەکانیان و کردارەکانیان بە ئیشی شەیتان دادەنێت و دزێوترین وەسفیان بۆ بەکار دەهێنێت، بەڵام لێرەشدا فەرقێکی گەورە هەیە لە نێوان زەلیلبوونی زەندیقایەتی بە دەست ئیماندارەوە لەگەڵ وردوخاشبوونی فەلسەفەی غەیری ماددی لە لایەن فەیلەسوفی ماددییەوە لەو سنورەدا کە خوێنەری تازە پێگەیشتووی کورد دەبینێت و دەبیەت: مومکینە زەندیقایەتی لە ولاتی ئیمانداردا باسی لێوە بکرێت وەك کە هەیە بێئەوەی بەسەریەوە بندرێت و لێی کەم بکرێتەوە، دواتر بە بەڵگەی ئیماندارانە هەوڵی پووچاندنەوەی بدرێت. واش بوە زەندیقی زۆر گەورە کتێبی داناوەو بڵاویش بۆتەوە، بگرە هەندێك لەو ڕەخنانەی کە زەندیقایەتی لە وشکەباوەڕی غەیبی گرتوە لەلایەن هەندێ زانای ئیماندارەوە بایەخیشی پێ دراوە. بەڵام لەو ماوەی سی ساڵەی دواییدا گەنجی کورد لە مەیدانی فکری فەلسەفی و سیاسیدا لە تاکە یەك ئاوازی ماتیریالیست بەولاوە هیچی تری بە سەربەخۆیی نەبیستوە. هیچ کەسێکیش جورئەتی نەکردوە یەکسەر ڕەخنە لە سەرچاوەو بنەما فکرییەکانی ماتیریالیست بگرێت وەیا بوێرێ بە هیچ فەلسەفەیێکی دیکەی بگری وەیا بڕای بڕای باسی نەگەیشتنە دی شتە خۆشە چاوەڕوانکراوەکانی بکات. وەیا ڕۆژەك لە ڕۆژان ژیانی کرێکاری وڵاتێکی وەك سویدو دانمارك تەرجیح بدات بەسەر ژیانی کرێکاری ڕووسیا...

سەرچاوە: مرۆڤ و دەوروبەر، مەسعود محەمەد، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم. بەغدا, ١٩٧٥ , لەبڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد.

# بۆ ئەمیری حەسەن پور له هەرکوێیەك بێت

مەسعود محەمەد

ساڵی ١٩٧٧ بۆ من ساڵێکی سیخناخدراوی وەتەنگهاتووی پڕ مەشغەلەتو سەرقاڵی بوو بەو جۆرەی نەتوانم لە نووسیندا هەمو فەرمانەکانی سەرشانم بهێنمە جێ. دەبوو بەشی چوارەمی (حاجی قادری کۆیی) تێدا بە چاپ بگات، نەشگەییشت.. دەبوو لە دەرفەتدا چاو بگێڕمەوە بەو نووسراوانەدا کە لە بارستی نامێلکەو گوتارو کتێبدا پەیتا پەیتا بۆ کۆڕی زانیاری کورد دەهاتن.. دەبوو لیژنەکانی زمانو ئەدەبو فەرهەنگ، کە من دەمڕاستیان بووم، هەنگاوی فراوانتر بەرەو ئامانجەکانیان هەڵێنن.. دەبوو پێوەندی کۆڕ بە جیهانی ڕۆشنبیریو قافڵەی زانستی تیژڕۆی دەرەوەی وڵات مەحکەمتر بێ.. دەبوو گۆڤاری کۆڕ بە گوتارێکی خۆمەوە لەگەڵ دەورکردنەوەی چالاکیەکانی کۆڕ بۆ خوێنەران، هەر لە لایەن خۆمەوە، بگاتە بازاڕی خوێندنەوەی کوردی.. دەبوو بێوچان وەرامی ئەو نامانە بدەمەوە کە لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات بە نیازو خوایشتی جۆراو جۆرەوە ڕوویان لێ دەنام.. دەبووو گەلێك "دەبوو" دیکەش مەودای ساڵو مانگو هەفتەیان لێم بە نیوەو سێیەك دەکرد..

قەڵەمم لە ڕووپەڕەکانی بەشی چوارەمی "حاجی قادر.." دەگێڕا کە دەستەیەك لە گەنجی خوێندەواری سلێمانی هاتنو بە نیوە تکاو نیوە ملانێ قەڵەمیان پێ لە باسی حاجی قادرەوە هەڵئەنگاوتم بۆ بەشی دووەمی "مرۆڤو دەوروبەر". کوردی گوتەنی حوکمی حاکم لەو گەنجانەوە زۆری بۆ هێنامو لەو بارە تەنگەتاو کراوەدا بایی ئەوەی لە سنووری بەشی دوەمدا بگونجێ لەو (دەوروبەر)ەم نووسی، تا ئێستا ڕێك نەکەوت بە چاپ بگات.

لە نێوان گەنجانی نامەنووس، لە دوورو نزیکەوە، دۆستێکی تازە ئاشنای کوردی کوردستانی ئێران، مامۆستا ئەمیری حەسەن پوور، لە زانستگەیەکی ئەمەریکاوە کە خەریك بوو شەهادەی بەرزی سەر بە زمانەوانی لێ وەربگرێ، بەسەری دەکردمەوەو لەبری نەوازشتی کە لە نامەکانیدا پێمی ڕەوا دەدیت، منیش بە پێی خوایشتی خۆی چی لە دەستم هاتبایە لە چاپەمەنی کوردی، بە تایبەتی هی کۆڕم بۆ دەنارد. جارێکیان بۆ دوایین جار، بەر لەوەی پێوەندیم بە کۆڕەوە نەمێنێت، نامەم لێی وەرگرتبێت، پاش نەوازشتو خوایشت، نیمچە لاپەڕەیەکی بە خەتی ورد بۆ نووسیبووم لە بارەی ئەو بیروڕایانەی من کە لە بەرگی سێیەمی (حاجی قادری کۆیی) هەر لە لاپەڕە (٣٤١)ەوە تا کۆتایی بابەتی ئەو بەرگەیان گرتۆتەوە. وا لێرە بەرەو خوار دەقی ئەو نامەیە بە ڕێنووسی خۆی دەنووسمەوە تاکو خوێنەر ئاگاداری تێکڕای دوو لایەنە لەیەکدی جوداکەی بیروڕای ئەو بەڕێزەو من ببێت. مامۆستا ئەمیر دەڵێ:

بەڕێز مامۆستا مەسعود محەمەد ٨نوامبر

دوای سڵاوو ڕێز: ماوەییێك لەوەوپێش نامەی ١٩٧٧/٩/٢٠ گەیشتو زۆر بە خوێندنەوەی دڵشاد بوم. بڵاوبونەوەی بیبلوگرافیای مامۆستا نەریمان–بەو زوانە– زۆر خەبەریکی خۆشە ئەگەر هەتا یەك دو مانگی دی بگاتە دەستم زۆری کەڵکی لێ وەردەگرم.

لە هاوینی ڕابردودا خەریکی لێکۆڵینەوەی بەشێك لە ئوتروحەکەم بووم کە باسی چۆنیەتی پەرەئەستەندنی وشەو ئیستانداربون (یان نەبوون)ی وشەی **vocabulary** کوردی دەکا، (شێوەی سلێمانی) ئەو بەشەی ئوتروحەکە چەند باسێکی تێدایە وەك:

١–جێگەی وشە لە پەیدا بونی زمانی نەتەوەییدا.

٢–سەرچاوەی وشەی زمانی کوردی.

٣–پروسەکانی **process** وشە دانان لە کوردیدا (دروست کردنی اسم، فعل، صفتو ...)

٤–فەرهەنگ نوسینی کوردی (فەرهەنگ نوسین لە پەرەئەستەندنو ئیستانداردبونی کوردیدا چ جێگەیەکی بوە؟.

٥-ئیستانداردبون (یان نەبون)ی وشەی کوردی لە مانگی رابردودا خەریکی باسی (ع) بومو ئێستە خەریکی نووسینیم.

بەعزە سەرچاوەییك هەن کە بیستومەو تا ئێستە نەمدیون:

-معروف قەرەداغی فەرهەنگی کشتوکاڵ بەرگی ١و ٢، ١٩٧٢ بەغدا.

-عەبدولقادر بەرزنجی فەرهەنگی زانیاری سلێمانی ١٩٧١

-جەلال غەریب فەرهەنگی زانیاری عەرەبی- کوردی ب١-٢، سلێمانی ١٩٧٤.

-پەروەردەو زانست ١٩٧٤ ژمارە ٧-٨، ١٩٧٤ ژمارە٤

-پەروەردەو زانست ١٩٧٣ ژمارە٤، کوردی- عەرەبی.

زۆرم پێ خۆش بو ئەوانەم وەدەست کەوتبا یان هەر نەبێ ناوەڕۆکی ئەو کتێبانەم بۆ ڕون بوباوە.

هەروەها ئەو نوسراوانەی خوارەوەم لێرەو لەوێ لە بڵاوکراوەکانی کوردا دیوە (ناونیشانەکانی!) کە هەموویان نوسراوی د. ئاورەحمانن. ئەگەر وەگیر دەکەون تکایە بۆم بنێرن:

((چالاکی مامۆستا گیوی موکریانی لە مێژوی فەرهەنگ نوسینی کوردیدا)) هاوکاری ژ ١٠٠-١٠٤، ١٩٧٣.

((فەرهەنگی خاڵ)) هاوکاری ژمارە ١٩-٢٣، ساڵی ١٩٧١.

((چەند ڕونکردنەوەو بەڵگەو تێبینیەکی نوێ دەربارەی فەرهەنگی خاڵ))، هاوکاری، ١٠٥-١٠٨، ١٩٧٣.

((چەند سەرنجێك دەربارەی زاراوەی پارێزگای سلێمانی))، هاوکاری، ١٩٧٣، ل١٥١-١٥٣.

((فەرهەنگی خاڵ))، هاوکاری، ١٠٥-١٠٨، ١٩٧٣.

((فەرهەنگەکەی مامۆستا جگەرخوێن)) هاوکاری ١٣٧-١٣٨، ١٩٧٣.

پارەکە، نامەم نوسی کە هاوکاریو چەند ڕۆژنامەی ترم بۆ بنێرن بەڵام وەڵامم بۆ نەهاتەوە.

بەداخەوە هیشتا ناتوانم لە سەر تەواوی بڵاوکراوەکانی کۆڕ بیروڕای خۆم دەربڕم چونکە هێشتا هەموویانم بە تەواوی نەخوێندونەوەو وردە وردە خەریکیانم. چاپکردنەوەی مەتنەکانی توحفەی موزەفەریە، ئەو کتێبەی (کە نایاب بوە) بە قاڵبێکی تازە خستنەوە بەر دەستانو لەو بابەتەوە کارێکی زۆر باش بو.

بەڵام پێم وایە (پێشەکی)ی مامۆستا هێمن لە بڵاوکردنەوەی کتێبەکە گرینگترە- چونکە بۆ یەکەمجار باسێکی گرینگی باوو بەیت گوتنی کردوەو بەعزە لایەنێکی کۆمەڵایەتی ئەو هونەرەی ڕون کردۆتەوە. جا بۆیە بە بیروڕای من ئەگەر مامۆستا هێمن خەریکی ئەو جۆرە نوسینە بێ (وەك ئەوەی لە سەرەتای (تاریكو ڕون) نوسیویێتی کارەکەی کەڵکێکی زۆر گەورەتری دەبێ.

هەروەها بیروڕای خۆم بە کورتی لەسەر بەشێك لە "حاجی قادری کۆیی" تەنیا لاپەڕەی ٣٤١ تا ئاخری بەشی ٣، دەردەبڕم ئەوە هەوەڵ جارە کە بە کوردی باسی فیودالیسم لە کوردستان دەخوێنمەوە. ئەو باسە لە چاپەمەنی کوردیدا زۆر تازەیەو هێشتا پێویستی زۆر بە لێکۆڵینەوەی مێژوییو تیوری هەیە. لێرەدا باسی مەسەلەییکی تیوری دەکەم کە پێم وایە لە باسەکەتدا ئەسەرێکی تەواوی هەیە: لە لێکدانەوەی نیزامێکی ئابوری- کۆمەڵایەتی وەك فیودالیسم یان کاپیتالیسمو .. پێویستە ژێربەنا base یان infrastructure لە ڕووبەنا superstructure جیا بکەینەوە، هەروەها لە لێکدانەوەی تەتبیقی فئودالیسم (لە چەند وڵاتدا) پێویستە ڕوبەناو ژێربەنا تێکەڵ نەکەین. ئەوە لە باری تیوریەوە. لەباری فەلسەفیەوە ئەوە بەو مەعنایەیە کە عەرزو ماهیە تێکەڵ نەکەین. بۆ وێنە ماهیە(=ژێربەنا) لە فئودالیسم ئەوەیە:

موڵکیەتی زەوی (وەسیلەی بنچینەیی ئینتاج) لە لایەن دەرەبەگەوەو چەوساندنەوەی جوتیار کە بەستراوەتەوە بە دەرەبەگ. ئەوەیە فیودالیسم-چ لە کوردستان، چ لە یابانو چینو هندو فەرانسەو ئینگلتەرەوە. ئەمە ماهیەتە. ئەوانی تر هونەر، ئەدەبیات، خانوبەرە،.. هەمو عەرەزو ڕوبەنانو کۆمەڵ بە کۆمەڵ جیاوازی هەیە. بەڵام دیسان ئاشکرایە کە هونەرو ئەدەبی فیودالی فەرانسە زۆرتر لە هونەرو ئەدەبی فیودالی ئینگلیزو یابان و.. نزیکترە تا لە هونەرو ئەدەبی سەرمایەداری ئێستەی فەرانسە. جا ئەمن پێم وایە لە باسی فیودالیسمدا مەسەلەی فیودالیسمی کورد دەبێ لەسەر ئەساسێکی تیوری لێك بدرێتەوە. لە باری سیاسیەوە تەناقوزی نێوان چینی دەرەبەگی کوردو دەرەبەگی بێگانە نابێ لەگەڵ تەناقوزی نێوان گەلی کوردو دوژمنانی تێکەڵ بکرێ- بە تایبەتی لە ئاخرو ئوخری قەرنی ١٩دا تا ئێستە (لە قەرنی ١٦و ١٧ڕا ئەو دو تەناقوزە تا ڕادەیێك تەتبیقات هەبو- بڕوانە لێکدانەوەی ئەحمدی خانی لە بارەی وەزعی ئەوزەمانی وڵات). جا ئەوە زۆر بە کورتی بیروڕای منە سەبارەت بەو باسە. ئومێدم وایە لەو چەند دێڕەدا توانیبیم بیروڕاکەم بە ڕونی دەربڕیبێ. ئەگەر پێویستە دەتوانم لە داهاتوودا زۆرتری لەسەر بڕۆم.

ئەو ڕۆژانە، چاوەڕوانم ئەو کتێبانەی لە ٢/٩/١٩٧٧دا لەلایەن کۆڕەوە ناردراوە بگاتە ئێرە، بەتایبەتی چاوەڕوانی دیتنی (وشەڕونان لە زمانی کوردی)و (دیوانا مەلایی جزیری)و (ڕینوسی کوردی لە سەدەیەکدا)و (چەند حەشارگەیەك...)م.

لەگەڵ ڕێزو سۆزێکی زۆر

ئەمیر

ئەم نامەیە لە ٨ی ئەیلولی ١٩٧٧ نوسراوەو وەك لە بیرمە لە دوا ڕۆژانی هەمان مانگدا بە من گەیشت.

زۆرم پی ناخۆش بوو ئەو تێبینییانەی وەها گەرموگوڕ لە تازە دۆستێکمەوە، لە پەردەی زەینمدا بە دیار وەرامی منەوە ئەبڵەق بمێننەوە، بە لای خاوەنەکەشیانەوە وەك تیری بێئامانج بەرەو بۆشایی، نە دەنگێك نە ڕەنگێك نەدەنەوە.

تانووتم دایە خۆمو سواری شانی بێ دەرفەتیم بووم: چەند شەوێکیان لە سەعاتە ناوەختەکانی نزیك بەیاندا نیمچە سیپارەیەکم درشتنووس کرد. بەڵام بەرلەوەی بتوانم لێی ببمەوە، بە ئومێدی هەلێکی لەبارتر لەگەڵ نامەکەی ئەمیردا خستمنە گۆشەیەکەوەو.. هەرێك هەرێکی پاڵەپەستۆی مەشغەڵەتی ڕۆژانە لە بیرمی بردنەوەو بزریشم کردن بەوەدا ڕێگەی وەرامدانەوەیەکی دیکەشم لێ داخرا چونکە دەقی قسەکانی کاك ئەمیر لە نامەکەدا چەسپ بوو نەك لە مێشکی من. پتر لە چوار ساڵ بەسەر ئەو ڕێکەوتەدا تێپەڕی تاکو ڕۆژێکیان لە هیکرا، نامەی هەرام، بێ مەبەستو بێ تەگبیر کڵاوی سەخرەجنی داڕنیو لەبەر دەستانم قوت بۆوە- سەدجاران دیمانەی بەخێر. منیش توند دەستی بەخیلیم لێ قایم کرد کە ئیتر چاوشێرکێم لەگەڵدا نەکاتو چی دیکەی بۆ بزربوونی پەنجەی ئەفسووس نەشکێنمەوە.

بەڵام ڕێکەوتێکی لەو دۆزینەوەیەی بێ تەگبیر سەیرتر، ئەوە بوو کەوا هەر چەند سیپارۆکە باسکراوەکەی لەگەڵدا نەبوو، خواو ڕاستان، چەند لاپەڕەیەکی پێشەکیەکەی بەشی چوارەمی (حاجی قادری کۆیی) لە خۆوە بێئەوەی مەبەستی من بووبێت، بە جیرانەتی نامەکە لەو چوار ساڵەدا سەریان نابۆوە. ئەوانیش لە غەیبەوە کەوتنە ناو دەستی بەتاڵو بی تەمامەوە، دیمانەی ئەوانیش بەخێر. یەکەم تێوە ڕامانم لەو ڕووپەڕانە، هەر لە ترووکەیەکدا، پێی سەلماندم کە دەشێ ببێتە پێش دەستی بۆ وەرامی نامەکەی کاك ئەمیر، چونکە کە لە بەرانبەر یەکدی ڕابگیرێن وەك (کامێراو وێنە) لە یەکدی ڕادەمێنن، ئیتر وێنەکە نیگاتیڤ بێتو کامێراکە دروستی بداتەوە وەیا ئەویان دروست بێتو ئەمیان بیکاتەوە بە نیگاتیڤ، لەلایەن کاتو باری بەوەلەدبوونیشەوە هەردوویان بێچوی یەك ساڵن ئەگەر هی یەك مانگ نەبن. وا لێرە بە دواوە ئەو چەند لاپەڕەیە دەکەم بە هەوەڵ "علیك" بۆ سڵاوی نامەکەی مامۆستا ئەمیر، دواتر مێوانداری تەواوی لێ دەکەم:

لاپەڕەکان بە شێوەی خوارەوە دەدوێن:

بەشی چوارەم

حاجی قادری کۆیی

پێشەکی

باسی حاجی قادر بەو شێوەیەی منی بە خۆیەوە خەریك کرد هەموو ئەو بەرتەکانەی [1] بەتەمایان بووم لێی هاتنە دی. زۆرینەی هەرە زۆری خوێنەری کورد، بە پێی ئەو واقیعەی دەوری لێ داونو کولانەی تێوەڕامانی لەبەر چاواندا کردوونەتەوە، یەك نیگایان لێ بۆتەوە ئەو دووربینەی سەیری بیروڕاو چاکەو خراپەو کۆمەڵایەتیو مێژووی پێ دەکەن ئەویش دووربینی مادی جەدەلی مێژووییە. ڕەنگە گومان لەوەدا نەبێ کەوا بەر لە نوسینە شەلو پەلەکانی من هیچ نووسینێکی دیکەی کوردی ئەو ئەرکەی نەکێشاوە پرسەکێك[2] بهاوێتە پێش هیچ یەکێك لەو باسە فەلسەفییە- ئابوورییە- کۆمەڵایەتییە- مێژووییانەی کە لە بیری مادی جەدەلی سەریان هەڵداوەوەو بۆ ماوەی سی ساڵی ڕابردوو سەرانسەری ئاسۆی ڕۆشنبیریو ڕامیاری فکری نەوباوی کوردەواری گرتۆتەوە.

هەڵبەت من کە لە ساڵی ١٩٧٢ دەستم دایە نووسین ئەم ڕاستییە یەکجار گرنگەم لێ ڕوون بوو، هێندەش بە لامەوە ڕاستییەکی بنجیو ڕەگداکوتاو بوو، دڵی خۆم بەوە دابین کردبوو کە لە ئاست نووسینە نەسەلمێنەکانی خۆمدا بە تەمای دۆستو برادەرو یاریدەرو پشتیوان نەبم لەو ڕووەوە کە دەمزانی کوردەواری خۆمان جێی هیچ بیروڕایەکی تێدا نابێتەوە ئەگەر لەسەر تەلی مادی تەقلیدی لێ نەدات.

هەر هەمان نیگای دروست بین، بەلای خۆمەوە، قەناعەتکێکی دیکەشی پێپەیدا کردبووم لەوەدا کە ناشێ بڕیارە یەکجۆرە فەلسەفییە گشتیەکانی فکری مادی لە دوو واقیعی جوداو پێچەوانەی یەکتردا بە ڕاست بگەڕێ: هەر وەك فکری مادی ناسەلمێنی عەبدو خاوەنەکەی، عەمەلەو پارەدار، ڕەنجبەرو موڵکدار، قەرزدارو سوود خۆر بخرێنە بەر یەك یاساو دەستوری دادی کۆمەڵایەتییەوە، منیش هەقمە نەسەلمێنم میللەتی کوردو داگیرکەرە کۆنینەکانی باربەری هەمان بۆچوونو قەناعەتو دەستووراتی فەلسەفەی مادی بن کە بە نیگایەکی درشت بینی ئەوتۆوە سەیری هەموو مێژوو دەکات ناتوانێ حیسابی ڕاستودروست بۆ جودایی نێوان قۆناغە مێژووییەکانی میللەتی کەرت کەرتو ژێردەست لەگەڵ میللەتێکی دیکەی زاڵی یەکگرتوودا بکات. وادیارە، بە عادەت، دانەری نەزەرییەی سەر بە کۆمەلایەتی- ڕامیاری لە پێناو لوسو لێکیو بێگرفتیو پەراوێز فرەوانی پەکی بەوە ناکەوێ میللەتی بێ هێزو کەم سامان دابەشو زۆرلێکراوی وەکوو کورد دەکەوێتە ژێر ئەو بڕیارانەی کە لە نەزەریەکەیدا بەسەر میللەتێکی دەسەڵاتدارو یەکگرتووی داگیرکەردا دەهێنرێت، بە زۆریش دانەری ئەو نەزەریانە بۆ خۆی تاکێکی میللەتی دەسەڵاتدارو پێشکەوتووە، بویە بە درەنگەوە دەماری بەزەیی بەخەبەر دێتو لە کوێرەڕێگاو لاڕێیەکانی نەزەریەیدا حاڵوباری میللەتی زەعیف تێ دەخوێنێتەوەو بۆرە حیسابێك بۆ زەرفی تایبەتی ئەو دەکات. بێگومان ئەگەر دانەری نەزەریەی مێژوویيو ڕامیاریو ئابووری لە واقیعی میللەتێکی کەرتکراوو هەژارو دەستبەسەرەوە هەوەڵ بەردەکانی بناخەی بیروڕای خۆی هەڵ بنێت، پتر بە حیسابی تایبەتی ئەو جۆرە میللەتانەوە خەریك دەبێت، ئەوساش ڕۆشنبیر بە ویژدانێکی حەسایەوەترەوە پشتگیری لەو بیروڕایە دەکەن چونکە کە بیروڕا لەسەر بنەمای مافی میللەتی ژێردەستو لێ قەوماو هەڵستابێت لزوم بەوە نامێنێ هەر جارە لە پشتگوێ خستنی زەرفی میللەتی کەمدەسەڵاتدا عوزرو بەهانەی (قوربانیدانی بچووك لە پێناو سوودی

---

[1] تەك: فعل، بەرتەك: ردفعل.

[2] پرسەك: علامە استفهام

گشتی ئادەمیزاد) وەك پەردەی درۆزن بەسەر هەڵوەستی هەلپەرستدا بکێشرێت.

((تۆ بڵێی بشیابا لە کوردستانی ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمدا بانگەوازی "ئەی کرێکارانی جیهان یەکتر بگرن" بەزر بێتەوە کە ئەوساو جارێ کرێکاری ناو بانگەوازەکە لە کوردستاندا بە خەیاڵاندا نەهاتبوو چ جایی پەیدا بووبێت؟ ئەم چەند دێرەی ناو کەوانەم لە نوسینەوەدا تێچێن کرد.

خواستنی چاویلکەی میللەتی بەهێز لەلایەن میللەتی بێهێزەوە بۆ تەماشاکردنی کۆمەڵایەتیو مێژوو کە لە جێگەو کاتی جودادا سەری هەڵداوە، وەك خواستنەوەی چاوی دەوڵەمەند لە لایەن هەژارەوە، رەنگە هێشتا لەم حیسابەدا هەژارەکە کەمتر غەدری لە خۆی کردبێ، چونکە دەشێ رۆژێك لە رۆژان، لە بەشینەوەی گۆشتی صەدەقە وەیا لە داوەتو پڵاولۆغانێکدا بابای هەژار لوقمەیەکی دەوڵەمەندەکەی پێ بگات. وەیا لە تەقڵەی زەمانەدا حاڵو بارو سامانێکی بۆ رێك بکەوێ. بەڵام وەك دەزانین میللەتی فەقیری کورد، ئاسایی لە وەهمو ورێنەشدا ئەو تەرزە هەڵکەوتە خۆشانە بەخۆیەوە نابینێ. لەبەر ئەمە کە گەنجی کورد دێتو لە مێژوودا کوردەواری بە ئەڵمانەواریو رووسەواریو فرەنگەواری دەکرێو جلکی کۆمەڵایەتی ئەوان لەبەر دەکات بە کێشانەو پێوانەی ئەوانی هەڵدەسەنگێنێت هێند لە میللەتەکەی پشترێ دەبێو وەها خۆی لێ نەناس دەکات هەر دەڵێی "خمیس افندی" یەکەی شیعری شێخ رەزایە کە لە چەند بەیتێکدا شکات لە دەست خۆ لێ نەناس کردنەکەی دەکات:

خۆی کرد بە تورکو لێمی خورێ (کیم بلر سزی)؟
پێم گوت: من فلانە کەسم مامە شێخ رەزام
تا نمزمیسن "خمیس افندی" مگر بزی

بێجگە لەمە، هەرجارە کە دەبینم نووسەری کورد لەسەر رووی کاغەزو بە نووکی قەڵەم میللەتی کورد راپێچەك دەدات بۆ نێو جغزی میللەتانو بەندو بالۆرەی خۆشکەڵەی مرۆڤ-نەوازیو یەکسانیو برایەتی هاورێیو ئەو تەرزە ئاهەنگە خەولێخەرەو سەر گوزشتە چەورو لووسانەی رامان بناگوێیان دەکا بە دەست خۆم نییە، لەوپەری سەیر پێ هاتنەوە وەك کە بەدوا حەیرانانداندا "تواى هوو"ی لێ دەکێشن منیش بەدیار ئەو قسە لۆق لۆقاویەو شاشو پێشانەدا لە بەر خۆمەوە دەڵێم:

تواى هوو!! برالە، هەمزە لە عەبباسی چی؟ جەنابی (خمیس افندی) بە زمانێکم لەگەڵدا بدوێ تێت بگەم. من مامە کوردە کەنەفتە پرزۆڵەکەی چەند هەزارساڵیم، لە فەرمایشتە زرینگەدارە بەگزادەکانت بەڵەد نیم. واز لە سازو ئاهەنگی فەرەنگو چینو ماچینو کەمەرچین بهێنەو وەرە لە سەر بەردە رەقەکەی نێو هۆو پارچە هەرزنەی لەگەڵم هەڵتووتەکێ بە ئەزمانی مام لالۆو خاڵ پیرۆتان لەو گێلمە گێلمەو تورکە تورکەم دەرباز کە..

بە راستی ئێمە کە دێین وەك وێنەگری هونەر کار لە پەنا زاراوەی زانستیو رستەی رەوانبێژانەو بۆچوونی فەلسەفییەوە خۆمان لە ژیانە یەکجار دواکەوتە سافیلکە روتو رەجاڵەکەی میللەتی هەژاری کەنەفتی وەك کورددا دەنووسێنینو باڵا هەڵقرچاوەکەی دەدەینە بەر ئەو نیگایەی کە دەیبرینە باڵای پۆشتەو پەرداخان. هەر دەڵێی ئەو ئەندازیارە خەیاڵ پڵاوەین کە دێت زنجو کۆختە شرە سەرانگوێلکاویەمانمان لە دێیە نیوە وێرانەکانماندا بە پەرگارو گۆنیاو شاقووڵ تاقی دەکاتەوە: هەروەك ئەو زنجە شرانە یەك تاکە بستی بنمیچو دیوارو دەرگەی لەسەر حیساب هەڵستاویان تێدا نییە پەرگارو گۆنیایان لەسەر بگەرێ، میللەتی زەلیلی وەك کوردیش هیچ بە بەرەوە نییە لایەق بێت بخرێتە بەر حوکمی ئەو نەزەریەو بۆچوونانەی لە میللەتی بەهێزو پێز هەڵدێنجرین. ئەندازیار ئەگەر بەچاوی خۆی زنجە شرەکان ببینێت بیر لە گۆنیاو پەرگار ناکاتەوە، بەڵام کە پلانی زنجەکانی بۆ خرایە سەر کاغەزی لوسو لێك هەموو ئەمرازەکانی تاقمی قتووی ئەندازەییان لەسەر دەگێرێو بە سانتیمیان دەپێوێ، هەڵبەت هیچ کامێکیش لەم ئەمرازانە لەسەر رووی کاغەز کرە ناکات. نووسەریش وەك ئەندازیار گەر بێتو ئەو واقیعە هەژارە لە حیساب بەدەرەی میللەتی کورد بەهۆشو گۆشی ئازادی خۆیەوە بگرێ بە دڵیدا نایێ پەرگارو گۆنیای ئەو فەلسەفانەی لەسەر بگێرێ کە لە واقیعێکی زێدە پێشکەوتووی وەك ئەورووپا هەڵێنجراون. بەڵام کە ناوی کوردی لە نووسیناندا هاتە بەرچاوو لە تەك ناوی میللەتی دیکە سەری پێداگرت دیمەنەکەی لێ دەگۆرێو جوداوازیە زلەکانی نێوان میللەتی کەنەفتو هی تێرو تەسەلی بەسەر چاواندا دەکشێت، هێندەش بێ گرفتو کۆسپ خلیسك دەبات هەست بە خۆی ناکات، هێندەش زیهنی ئاخنراوە بەو فکرو فەلسەفانەی کە هەموو میللەتان دەدەنە بەر یەك لێکدانەوەو یەك کێشانەوەو پێوانەوە زۆر بە زەحمەت دەتوانێ بیر لە هەبوونی جوداوازی نێوان میللەتان بکاتەوە یان بیرای بیرای بیری لێ ناکاتەوە. بەلای خۆشیەوە راستییەکی ئەوندە گەورەو ئاشکرای پێکاوە دەمەتەقە هەڵناگرێ. بەڵام هەمان نووسەر کە دەبیەت ئایینێکی وەك ئیسلام بەخەڵق رادەگەیەنێ برا بنو ستەم لە یەکدی نەکەن دەرحاڵ دەنگی رەخنەو بەرهەڵستیی هەڵدەبرێتو دەڵێت: چۆن دەشێ هەژارو دەوڵەمەند وەکو یەك حیساب بکرێن؟ تەنانەت بە جۆرێك جودایی نێوان چینەکان دەکاتە دیواری هەڵاواردنو لەیەکدی ترازاندن هەر دەڵێی رۆژەك لە رۆژان ئەو خەڵقە مەرحەبایان لە یەکدی نەکردوە، خۆ ئەگەر فەقیرەکە بەپێی تەعلیماتی نووسەرەکە بەگژ واقیعدا نەچێ خێرا مۆری خیانەتی چینایەتی لێ دەدات... دەبێ چینەکان وەها بەشەر بێن کە ئاشتبوونەوە هەڵنەگرێ: شەری نێوان چینەکان لەلای ئەو باوەرەی کە هەموو میللەتان بەیەك نیگا سەیر دەکات تەنها بە تێچوونی چینەکانی سەرووی کۆمەڵایەتی کۆتایی قبوڵ دەکات، تێشت ناگەیەنێ ئایا ئەو تاقمەی لە حوکمرانیدا دەبنە جێگری تاقمی پێش خۆیان

چۆناوچۆنی تەرخان دەبن بۆ خزمەتگوزاری میللەت بیٚ تۆقاندنو بیٚ دەستدریٚژی، لە حاڵێکدا هەرچی ئامێری دەربڕینی دەنگی ناڕەزایی هەیە لە میللەت حەرام دەکریٚ.. نەسەلماندنی لەسەر بە خیانەت دەژمێرریٚ!! هەر ئەم نیگایە سەرلەبەرەو سەرانسەرەیشە وەها لە خاوەنەکەی خۆش دەهێنێت کوردو ژاپۆنو فەڕەنگ..و هەموو جیهان یەك کێڵگەی بیٚ جەمسەری یەکچوونی ستەمو داد بن.. ڕەنگە لە ئاست ئەم تێبینیانەمدا بگوتریٚ تەماشاکردنی هەموو میللەتان بەیەك نیگا کە دەکێشێتەوە سەر بەشەڕهێنانی چینەکان بە نیازی بڕاندنەوەی تۆوی (چینی چەوسێنەرەوە) لە تاکە سەرچاوەی مرۆڤدۆستییەوە هەڵدەقوڵیٚ لەو ڕووەوە کە یەکچوونیو یەکسانی میللەتان لە گۆشەنیگای کۆمەڵایەتیو مێژووی بەرفراوانی مرۆڤەوە زووترو ئاسانترو کاریگەرتر یاریدەی تێکڕای چینە هەژارەکان دەدات بۆ خۆڕزگارکردنی یەکجارەکی لە ستەمی تێکڕای زۆرداران کە بریتین لە چەوسێنەرەوەکان.

لە پێشەوە دەڵێم ئەم بۆچوونە تەنها لە حاڵەتێکدا ڕاستی دەکرد کە هەموو جیهان بریتی بوایە لە یەك دەوڵەتو یەك میللەت: هەر جیهان بکە بە دوو دەوڵەت بۆچوونەکە دەبێتە خەیاڵی، وەیا بیکە بە دوو میللەت دیسانەوە بۆچوونەکە دەبێتە خەیاڵی، چونکە لە هەردوو باردا دوو دەوڵەتەکەو دوو میللەتەکە وەها لەیەکدی جودا جودا دەبنەوە نەشیٚ یەکچوونی لە نێوانیاندا هەبیٚ:

بیرکردنەوەی وەها سەراوی پاشماوەی خەیاڵە خۆشکەڵەکانی بەر لە ١٠٠ ساڵە، لە زۆر شوێنی پێشکەوتوشدا دەمێکە ئیفلاسی کردوە (دەشبوو لە سەرەتاوە گەشە نەکات)و وازی لیٚ هێنراوە چونکە بەچەند تەجرەبەیەکی سەرەتایی خەباتی میللەتان ئاشکرا بوو تێکبەستنی فرەنسەو ئەفغان بەیەك زنجیری فەلسەفەو خەبات وەك هەڵکێشانی تەرازوویەکە کە تایەکی بەتاڵ بیٚ. ئەم ڕاستییەش لە نێوان هەموو ئەو لایەنە شۆڕشگێڕانەی کە ڕابەرایەتی بزووتنەوەی بەهێزو پێشکەوتوو دەکەن سەلمێندراوو لەکارهێنراویشە، هەر بۆیەشە نایەن خۆیان لە میللەتی تێشکاو ببەستنەوە، بەڵام بەپێی هێزو پێشەوایەتیەکی لە دەستیاندایە داوا دەکەن میللەتی دیکە بەرژەوەندی خۆی لە هی ئەوان گریٚ بدات بە مەرجێك کە ئەگەر تێکبەستنەکە لەسەریان گران کەوت بتوانن لەلای خۆیانەوە گرێی پێوەندییەکە بکەنەوەو خۆیانی لیٚ ڕەها بکەن.. ڕاستییەکەی ئەم مامڵەتەش هەزاران ساڵە لەلایەن دەسەڵاتدارەوە بۆ سوودی خۆی بەسەر بیٚ دەسەڵاتدا هێنراوە کە هەمیشە بەرژەوەندی بەردەستەکانی لە بەرژەوەندی خۆی بەستوە:

دەمەویٚ بڵێم مامڵەتەکە هی زێدە زەکای فەیلەسوفەکانی ئەم سەردەمە نییە.

بێگومان لەیەکنەچوونی میللەتی هەژارو ساماندار بەرچاوترە، گەلێکیش بەرچاوترە، لە لێکنەچوونی تاکی هەژارو تاکی دەوڵەمەند، ئەم ڕاستییەش لەوانە نییە نەیەتە بەر نیگای مرۆڤی زیرەکی هوشیاری زانای وەك ئەوانەی لە سەدەی نۆزدەیەمدا بنەکای تیۆری مادییان هەڵدەنا. بەڵام وا پیٚدەچیٚ ئەو زاناو هۆشیارانە بە ئومێدی ئەوە بووبن چینە هەژارەکان لە هەموو جیهاندا بەزوویی پەندی برایەتیو هاوخەباتیو هاوبەرژەوەندی لە فەلسەفەکەی ئەوانەوە فێر بنو لە ماوەیەکی مەیلەوکورتدا سوودی موشتەرەك بەرەو خەباتی یەکگرتوویانەوە ببات، بە تایبەتی پرۆلیتاریای ئەوروپای ڕۆژاوایی کە بەلای نەزەریەی مادییەوە نێرکی بزووتنەوەی چینایەتی جیهانی بوو، نەزەریەش خۆی بەوە ئیقناع کردبوو کە گەیشتنی عەمەلە بە حوکم لە وڵاتی پێشکەوتوی ڕۆژاوادا بڕیاری مێژووە، ئیتر هاتنی ئەو ڕۆژە مەوعوودەی ڕمانی چەوساندنەوەکە لە (مسلمات)ی نەزەریەکە بوو وەهای دەکرد وردپێوی نەکریٚ لە جوداوازی پلەی گۆڕانی میللەتەکان: وا دەرگەی بەهەشت خەریکە دەکرێتەوە، چ لزوم هەیە بە هەڵاواردنی بلووجستان لە ئەڵمانستان!

نا–واقیعیەتی ئەم تەرزە لێکدانەوەیە خێرابەخێرا بۆ زۆر کەس دەرکەوت، خۆ لە جغزی هەڵوەستی "ڕەسمی"دا هەر بە دامەزرانی یەکەم دەوڵەتی "پڕۆلیتاریایی هەژاردۆست" لە هەوەڵ تێکەڵبووینەوە بە سیاسەتی نێوان دەوڵەتان قسە ڕۆیشتوەکانیان کەوتنە سەرباری خۆ جوداکردنەوە لە یۆتۆپیای بزووتنەوەی یەکگرتووی هەژارانی جیهان، ئیتر هەموو هەوڵو تەقەلاّیان ڕووی لە تاکە ئامانجی پاراستنی دەوڵەتەکەیان کرد، دەشبوو هەروەها بکەن دەنا بێئەوەی بتوانن چی ئەوتۆ بزوتنەوەی جیهانیی هەژاران بەرەوپێش ببەنو دەوڵەتەکەیان لیٚ هەڵدەوەشایەوە. بەڵام ئەم خۆدزینەوە ژێرانەیەیان لە چارەنووسی هەژارانی جیهان بە نیازی پاراستنی خۆیان، نەیخستنە سەر باوەڕی دەروێشانەی دڵپاکانەی ڕەفزکردنی خەباتی غەیری خۆیان بۆ خۆیان: هەروەك پاراستنو سەلامەتی دەوڵەتەکەیان لە چارەنووسی هەژاری وڵاتی دیکەی دابڕین هەروەها هەمان ئامانجی "خۆپاراستن" وای کرد جانفیدایی هەژاری جیهان بۆ خۆیان قبوڵ بکەن. ئەم ڕووپەڕەیەش لەگەڵ پێچانەوەی قۆناغی شەڕی دوەمو ڕوونبوونەوەی لایەنە خەیاڵیەکانی ئەسڵی فەلسەفەکە، وردە وردە، بەرەو پێچرانەوە بۆوە تاکوو دەبینین لەم ڕۆژگارەدا ژمارەیەکی زۆر لە حیزبە شیوعیەکان خۆیان دەدزنەوە لەو جانفداییو قوربانیدانە یەکلاییەی جاران دەیانکرد بۆ تاکە دەوڵەتی شیوعیو ئیستا خۆیان بەو دەگرن.

ڕوونبوونەوەی جوداوازی بزوتنەوەی (چەپ) لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێك تا ئەو ڕادەیەی بەگژ یەکدیدا بێنەوە، هیچ عوزری بەدەست مرۆڤی چاوساغەوە نەهێشت لەوەدا هەر سوور بیٚ لەسەر هاوچوونکردنی ڕابوردووی میللەتان بیٚ خوێندنەوەی جودابوونی حاڵو باری ئەو میللەتانە هەر لەبەر خاتری دانەلەنگانی ڕێزو پایەی فەلسەفە. چەند سەیرە فەلسەفەیەك بریتی بیٚ لە وشەو فکرکە هیچیان ڕۆحیان لەبەر نییە تاکوو پەکی بە دڵدانەوە کەوتبیٚ خاوەن فەلسەفەکەش هێند لەمێژ بیٚ مردبیٚ کە ئەگەر باوەڕی بە ڕۆح هەبایە

ڕۆحەکەی کەوتبێتە سەر بارێك ئەویش پەکی بە دڵدانەوە نەکەوێ، ئا ئەو فەلسەفەیەو خاوەنەکەی ڕێز لێنانیان لەوەدا بێت ڕابوردوە یەکجار لەیەکتر جوداکانی میللەتی بەهێزو بێهێز وەکوو یەکدی بخرێنە ژێر حوکمی ئەو بڕیارانەی کە ئەرکی قورس دەخەنە سەر میللەتی بێهێزی ئەوتۆ هەتا بڵێی موحتاجی دڵدانەوەیە.

پێشەکیەکەی (حاجی قادر..) لێرەدا کۆتایی دێت. بچینەوە بۆ نامەکەی مامۆستا ئەمیر.

لە شێوەی نووسینەکەی ئەو بەڕێزەوە دیارە نەیویستوە پاتەو پات پێم بڵێ شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی بەو جۆرە ڕەمەکیەی کە لە بەشی سێیەمی (حاجی قادر..)دا کراوە جایەز نییە. لەوەدا سپاسی دەکەم، بەڵام پێم خۆشە لێم بسەلمێنێ کە من دێم لە گۆشەنیگای خۆمەوە سەر بە کۆمەڵایەتیی زێدە مەفهومی کورد دادەگرم لە پێشەوە ئەو شیکردنەوە (زانستی)یانەی بە عادەت هانایان دەبرێتە بەر، لای من ئیفلاسیان کردوە تا ئەو ڕادەیەی ناتوانن بە هیچ جۆرێك نە ژوورخان نە ژێرخانی کوردەواری ڕوون بکەنەوەو نە تەفسیری ژوورخانەکە لە ژێرخانەکە هەڵێنجن، ئەو شیکردنەوانەی ناویان بە عیلمی ڕۆیشتوە هەر لەوەندەدا دەتوانن ڕاست دەربچن کە میللەتان وەکو بوکەشوشەی کۆککراو لە سندوقچەی ئەوانەوە دەربێنو بە سازی ئەوان بڕەقسن بە تەواوی وەك مەفهومی ڕوباعیەکی خەییام کە دەڵێ:

*ما لعبتگانیمو فلك لعبت باز*
*از روی حقیقتی نه از روی مجاز*
*بازیچه همی کنیم بر نطع وجود*
*رفتیم بصندوق عدم یك یك باز*

تەنها فەلەکەکە بگۆڕە بە فەلسەفە لێك چوونەکە تەواو دەبێ دەمێکی لە مێژەوەیە بەوە ڕاهاتووم لە گلێنەی چاوی خۆمەوە سەیری کۆمەلایەتیو مێژوو "زۆر جاران زانستی تەتبیقی"ش بکەم نەك لە عەدەسەی چاوی نەزەریانەوە. منیشو تۆیشو هەموو عەمرو زەیدێکیش دەبی نەزەریەو خوێندنو تەجرەبەو تێوەڕامانو بیستنو دیتن یاریدەی ڕونایی بینینمان بدەن نەك لێمان ببن بە عەینی بینینەکە. من کە بە چاو لە شوێنێکدا ماسی زیندوو ببینیمو ئاوی تێدا نەبێ دەرحاڵ ماسییەکە بەدرۆ دەخەمەوە چونکە ماسی بێ ئاو ناژیت چ جای ئەوەی بە دووربینی نەزەریە ئەو ماسییە زیندوە لە جێگەی بێ ئاودا ببینمو بڕوا بە دیتنەکەم بکەم. جۆرج برناردشۆ لە پێشەکی چیرۆکی **devil's disciple** شاگردی شەیتان بەر لە ٨٠ ساڵ زیاتر دەڵێ:

خەڵق بەوە ڕاهاتووە لە کتێبانەوە سەیری ئەو شتانە بکات کە لە بەردەستو دەمیدان.

کۆمەڵایەتیو مێژووش زەڕڕەو ئاسمان نین هەر بە کتێب تێیان بگەم، ئەوانەی نەزەریەی "زانستی"شیان لەو دیاردانە هەڵێنجاوە وەکوو منو تۆ سەریان بە مرۆڤی کۆنو نوێ داگرتوە، منو تۆش دوای ئەوان سەر بە مرۆڤەکەو نەزەریەکەی ئەوانیشدا دەگرین قۆنتەراتیشمان نەگرتووە لەسەر ڕاست دەرچوونی نەزەرییەکان کەس دوژمن نییە بەڕاستبوونی نەزەرییەکان، بەڵام نە مەرجە ڕاست بن نە ڕەوایشە چاوی خۆمان بە درۆ بخەینەوە لە ئاست هەڵەی ئەواندا، ئینسافیش قبوڵ ناکات مێژوو کەوڵ بکەین هەر بۆ ئەوەی کەوڵی نەزەریەکانی تێ وەرپێچن. من کە بە چاوی خۆم چۆنایەتی مامڵەتی خەڵق، بە هەژارو دەوڵەمەندییەوە، لەگەڵ یەکدیدا ببینم ناچمەوە بۆ نەزەریە بزانم چ فەتوایەکم بۆ دەدا لە بارەی ئەو مامەڵەتەوە، چونکە ئەگەر هەر ئەوە بڵێ کە من دیتومە دەبێتە "تحصیل حاصل" بەتەماش نیم درۆی لێ بسەلمێنم.

من دەگەڕێمەوە بۆ نەزەریە لەو شتانەدا کە خۆم دەیانزانم نەك بە نیازی فەتوا لێ وەرگرتن بەڵکو بۆ حاڵیبوون لە ڕاستیو هەڵەیی نەزەریەکە خۆی. من واقیع دەگرم بە شایەد لە نەزەریە نەك نەزەریە دەگرم بە شایەد لە واقیع. ئەو کۆمەڵگەیەی دەیناسمو لەگەڵیدا دەژیمو هەست بە نەبزی دەکەم پتر مەفهوومە بە لامەوە لە نەزەریەی ناو کتێبان. هانا بردنم بۆ نووسینی ناو کتێبان لەو شتانەدا دەبێ کە تێیان ناگەم وەیا نایانزانمو لای من مەوجود نین خۆ ئەگەر لە سەهوێکیشی گێڕامەوە زۆری مەمنون دەبم بەڵام هەمیشە مەمنونی ئەو واقیعەش دەبم کە سەهوی ناو کتێبانم پێ دەڵێ.

وەها بوە لە دەعوای "تسویە" کە مڵکایەتی زەوی ساغ دەکاتەوە لە دێیەکدا کە عومری خانوەکانی لە ٦٠ ساڵ پتر بوە. بارستی گوفکەکانی لە بەرزایی خانوەکانی هەڵکشاوتر بوە. درەختی چەمەکانی چەندین جار چەمبڕ کراوە، دیمەنی جۆگەو شەلەگەو مەزراکانی دەیان ساڵی ڕانواندوە، ئا لەو دێیەدا بابای "دادپرس" داوای "مستمسکات"ی لە خاوەن زەوی کردوە بۆ ئیسپاتی "تصرف"ی لەو زەویانەدا. بەو پێیە دوو کیلۆمەتری چوارگۆشەیی لە کێڵگەو کۆنە خانوو گوفكو جۆگەو چەمو بەراو و شیناوردو گەنمو جۆ بەلای ئەو دادپرسەوە نرخی یەك پارچە کاغەزی نوسراوی نەبوە کە دەشێ بە دە دینار بەرتیل ساز بدرێ. بە لای منەوە "مستمسکات" هێزە بۆ واقیع، نەك خالقی واقیع. کە موستەمسەکاتیش نەبوو پەکی لەسەر ناکەوێ، چونکە واقیعەکە هەیە، بایەخی موستەمسەکیش لەوەدا دەبێ کە لەگەڵ واقیع بگونجێ:

نەزەریە بریتیە لەو موستەمسەکەی دادپرس داوای دەکات لە ئاست چۆنایەتیو چەندایەتی زەوی بە بەراوو پشتاو و پاوانیەوە. جا ئەگەر موستەمسەکەکە بە سەهو چووبوو لە زۆریو کەمی ئەو چۆنایەتیەو چەندایەتیەدا نابێ خەریکی گونجاندنی زەویەکە ببین لەگەڵ ئەو هەڵەیە، بە پێچەوانە دەبێ هەڵەکە ڕاست بکەینەوە بە پێی داخوازی واقیعی دێیەکە. خۆ ئەگەر هەڵەکە ڕاستکردنەوەی هەڵنەگرت دەبێ موستەمسەکەکە بسوتێنین.

نەزەریەو موستەمسەك جۆرێكن لە "ژوورخان-ڕووبەنا" شەرەف لەوەدا وەردەگرن كە بە دروستی وێنەی "ژێرخان- ژێربەنا" بدەنەوە، دەنا دەبنە بوختانكەرو شایەدی درۆزن.

ئاكامی ئەو نەزەریانەی ٤٠ ساڵە گەنجی كورد بە خۆیانەوە خەریك دەكەن شتێك نییە پێویست بە كوتانەوە بكات، چارەڕەشیش بەوەدا نابێ كە لە ژوورخانی نەزەریانەوە بباریێت.

جارێكی دیكەش با بگەڕێمەوە بۆ نامەكەی مامۆستا ئەمیر.

لەو چەند دێڕە ئامۆژنامەیەدا كە داوامان لێ دەكات "ژێربەناو ڕووبەنا- ژێرخانو ژوورخان" تێكەڵ بەیەكدی نەكەین، ڕومان بەرەو دەستورێك دەكات دەمانگەیەنێتە ئاكامی ئەوتۆ كە مامۆستا ئەمیر نایەوێ لە خەونو خەیاڵیشدا بیانسەلمێنێ: كە پێت بڵێم "ماهیە"و "عرض"ی مرۆڤەكە خۆی تێكەڵ-مەگە، یەكسەر دەرەبەگو جوتیار پارەدارو كرێكارو داگیركەرو داگیركراو و عەبدو خاوەنەكەی هەمویان دەچنە ژێر یەك سەرەناوەوە چونكە "ماهیە"ی هەمویان مرۆڤایەتییە، هەرچی پارەو مڵكداریو داگیركردنن ئازادی عەبدایەتیو ئەو جۆرە خەسڵەتانە هەیە هەمویان "عرض"نو لە لاوە هاتوونەتە سەر مرۆڤەكە. بەتەواوی وەك كە مامۆستا ئەمیر دەیەوێ لێی بسەلمێنین "ماهیە"ی دەرەبەگایەتی كوردو فارسو ئینگلیز یەك چشتەو بەوە لە یەكدی ناترازێن كە "عرض"ی وەك ئایینو ئەدەبو هەژاریو ساماندار یو دادو ستەمو پێشكەوتنو پاشكەوتنو دەسەڵاتو ژێردەستی لە كوردەوە بۆ ئەڵمان دەگۆڕرێن. بەپێی ئامۆژگاریەكەی كاك ئەمیر تۆ دەبێ چاو ببڕیتە ئەو ڕاستییە بنجییە گرنگەی كە كوێخا ڕەسوی وەسوێنەی پشتدەر لەچەند پارچە زەویەكیدا چوار ڕەنجبەر دەچەوسێنێتەوە ئیتر بە خۆیو جەمەدانە شڕەكەو خانوە وێرانەكەو بزنە گەڕەكەو دارسێوە كرمژنەكەو حەوشە گووفەكەكەیەوە لەژێر سەرەناوی "فیۆدال"دا دەبێتە هاوشانی خانەدانی "برنادۆت"ی سوید بە خۆیو پۆپی ژیارو زانستو هونەری سەدەی بیستو یەكەمیەوە نەك بیستەم...

"زۆراب"ی جوتیاری دەشتی "هەریر"یش كە لەوەتەی سۆمەرو ئاكادەوە بە دوا كلكی گاڕەشدا گیانی خۆی تێكەڵ بە خەتە جووتی ناچارییەوە دەكاتو ئێواران وەك دەستی كەر لە كونە بۆقڕێكی كێچاوی دووكەڵاوی بێ ڕایەخو بێ خۆراك سەلار دەبێتەوەو لەگەڵ كاموسی مێردەزمە تێك دەئاڵێن، ئا ئەم زۆرابە هاوڕێو هاوچینو هاوچارەنووسی "هانز"ی لێخوڕی تراكتوری دەوری "مۆنیخ"ە كە دوای بەسەرچوونی فەرمانی ڕۆژانەی بە سواری ئۆتۆمبیلی خۆی دەچێتە هۆڵی مەستیو دڵداریو گۆرانیو دانس چونكە "ماهیە"ی هەردوكیان "ڕەنجبەریو كرێگرتەیی"یە لەوە بەولاوە كونەبۆقڕو تەلارو هەژاریو تێریو پڕ زۆڵیو پۆشتەییو سەرانگوێلكو هۆڵی دانس هەموویان "عرض"نو بایی سەری دەرزی ئەم دوو "هاوڕێیە، هاوچارەنوسە، هاودوژمنە، هاونازانم چییە" لە یەكدی جودا ناكاتەوە، تەنانەت ئەو ڕاستییەی كە "هانز" بێزیشی نایەت لەگەڵ ئاغاكەی زۆرابدا تۆقە بكات نەكا دەسكێشەكەی بگۆنێ، ئەویش ڕاستییەكی "عرض"یە كار ناكاتە سەر جوداوازی چینایەتی نێوانیانەوە لەوەدا كە "هانز" چەوسێنراوەو خوێنمژراوە ئاغاكەی زۆرابیش خوێنمژو چەوسێنەرەوەیە هەر چەند لەوانەیە كچی خۆیشی لە زۆرابی خوێنمژراو مارە بكات.

ئەم یەكچونكردنە شتی لەیەكدی جودا لە ڕێی بەكارهێنانی تەعریفو سنوردانانەوە بۆ تێبردنی جوداوازیە لە سنوور بەدەرەكانی نێوانیان، لەو ساڵانەدا زۆر بە چاپلوسی لە دەستوری یەكێك لە دەوڵەتەكانی ڕۆژهەڵاتدا بەكار هاتبو كە لە مادەییێكیدا نووسرابوو "العمل شرف والحكم تكليف و ليس تشريف" ڕاستییەكەی منیش بەدەست خۆم نەبوو یەكسەر بە لەهجەی نێو بازاڕی میللەتی ئەو دەوڵەتە گوتم "هات تكليف بلاش تشريف- تەكلیفم بۆ بهێنە تەشریفی پێ ناوی..".

ڕایەكەی مامۆستا ئەمیر كە دەنگدانەوەی بیروڕای مەدرەسەیەكی پانو بەرینو قوڵو دورو درێژی ئەم سەردەمەیە، لە لایەكەوە بە ناوی دۆزینەوەی بنەمای مادیی دیاردە كۆمەڵایەتیەكان پەنجە لە "ماهیەو ژێرخان" گیر دەكات، هەر بۆ تاكە مەبەستی گرێدانی ژوورخان لە ژێرخان "گرێدانی عرض لە ماهیە" تاكو كۆمەڵایەتیو مێژوو زادەی مادە بن نەك لە سەرچاوەیەكی نامادی هەڵقوڵیبن، لە لایەكی دیكەشەوە هەموو جوداوازیەكانی نێوان ئەو "عرضو ژوورخانانە" لە میللەتێكەوە بۆ میللەتێك كە تا ڕادەی بەرەواژ بوون پشت لە یەكترن بێبایەخ دەكات كە یەكسەر دەبێتە تێبردنی "پێوەندی سەبەبی" لە نێوان "هۆو ئاكام- سبب و نتيجه" كەچی دەبو دۆزینەوەی "بنەما، ماهیە، ژێرخان، ژێربەنا" ڕاستەوخۆ بمانباتەوە بۆ ئەو "عرض، ژوورخان"انەی كە بە پێی ڕاگەیاندنی فەلسەفەكە لەو ژێرخانەوە سەریان هەڵداوەو دەبێ بە ناچاری خزمی ئەو بن، دەنا ئەگەر ژوورخان بەند نەبێ بە ژێرخانەوە، "عرض" بەند نەبێ بە "ماهیە"وە، كەس پەكی لەسەر ناسینەوەی ئەو "ماهیە"ە فیۆدالە نەكەوتوە كە لە "سەردەشت" هێلكە بكاتو لە "تاران"یش خەنە بفرۆشێت. بنەماو ماهیەتی فیۆدالیسم بە یەك ڕستەی دە پیتی لێی دەبینەوە، وەك كە مامۆستا ئەمیر لێی بۆوە، بێ مامۆستاش دەیناسینەوە لەوەتەی ئادەمیزادیش هەیە ناسیویەتی. دەمێنێتەوە ئەو "ڕووبەنا، ژوورخان، عرض"ەی لەسەر زەقاییو ڕەقایی فیۆدالیسمەوە هەڵیداوە، ئەویان بریتیتە لە هەموو وجودی مرۆڤ بە خۆیو مێژوو و كۆمەڵایەتیو بڕواو كفرو دادو ستەمو خوێندوییو نەخوێندووییو شەڕو ئاشتیو برسیەتیو تێری ئەدەبو زانستو هونەركێشانەی شەرەفو نامووس و...و ... هەموو هەموو شتێكەوە هەر لەو دەمەڕا كە لە مندالْدانی داكییەوە بەردەبێتەوە سەر خاك تا ئەو كاتەی دەچێتەوە منداڵدانی خاكی سامناك..

ئنجا كە هەموو وجودی كوردی "فیۆدال" لەگەڵ هەمو وجودی ئینگلیزی "فیۆداڵ" هێندەی ڕەشو سپی پشت لە یەكتر بوونو

هیچ ئاکارێکی کۆمەڵایەتییان‌و هیچ ڕێکارێکی ژیانیان‌و هیچ خوتخویەکی خەون‌و خەیاڵیشیان، کەم‌و زۆر ئاشنای یەکدی نەبوون چ کارێکمان بە قەپێلکی بەتاڵ‌و حەتاڵی "فیۆداڵ" دەمێنێ کە هێندەی کەڵەشێری ئێواران لە بەڵێنی ڕۆژو تاو درۆزن بێ. زاراوەی ئەوتۆیی ئەگەر خەڵق بۆی نەبێ بەو دەروێشەی جندۆکەی نەدیتراوی شێخەکەی دەسەلمێنێ کاریگەرایەتی پێوە نامێنێ.

گوێنەدان بە جوداوازی لە حەدبەدەری نێوان ژوورخانی دوو وڵاتی ڕواڵەتی فیۆداڵ یەکسەر سەرلەبەر دەمانکات بەو نوێژکەرەی کە لە حیسابی خۆیدا "ماهیە"ی نوێژو دەسنوێژ بەوە ناگۆڕێ ئایا لە بیابانێکدا "تیمم" دەکات وەیا لە قەراخ کانییەك‌و ژێر سێبەری درەختی میوەدارو بۆنخۆشدا بە ئاوی ڕوون دەسنوێژ ڕوو لە خواردن‌و بەرەو بەهەشت بوونەوەیە، سەیریش لەوەدایە دەبوو تیۆری مادی پتر لە باوەڕی نوێژکەر پێداگرێت لەسەر ئاوو درەخت‌و میوە چونکە لە باوەڕی ئەودا، کە مادییە، ئەمانە بەهەشتەکەن..

ئنجا ماوە بڵێم بابای نوێژکەر جارێکی دیکەش لە جغزی باوەڕی خۆیدا بابای مادی جێ دەهێڵێتەوە بەوەدا کە ئاوی چنگ کەوت تەیموم بەتاڵ دەبێ، کەچی فیودالیزمی کورد کە وەك بەردی ڕەق تۆزی لێ هەڵناستێ تەیموومی پێ بکرێ، لە تەك هیچ فیۆدالیزمێکی پێشکەوتووی ئەم جیهانەدا بەتاڵ نابێتەوە.. ڕوتبەیە بەسەر شانی کوردا دوورراوە..

ئەی مامۆستا ئەمیر!
ئەی خوێنەری کورد!
ئەی تێکڕای ڕۆشنبیران!

کە قسە لە "ماهیەو عرض" بکەین‌و بایەخ بەو جوداکردنەوەیە بدەین دەبێ، هەر بەپێی ئەو لێکدانەوەیەی مامۆستا ئەمیر بۆی چوە، لە سەرەتای هەموو بایەخپێدانێکدا بڵێین کە دوو "ماهیە" هاوچوون بوون "عرض"ی هاوچوون بەرهەم دەهێنن. هەر لەم بەدیهییە سەرەتاییەوە دەبێ بڵێین جودابوونی "عرض" جودابوونی "ماهیە" بە ئیسپات دەگەیەنێ.

لێکدانەوەی مادی کە دێت‌و ژوورخان لە قۆناغی مێژوویی‌و هۆی بەرهەمهێنان گرێ دەدات ناتوانێ، نە بە ئاسانی‌و نە بە زەحمەت، خۆی بدزێتەوە، لە یەکدی نەچوونی ئەو ژوورخانانەی کە گۆیا لەسەر بنەمای گاڕەش‌و گاسن‌و زەوی‌و باران‌و دانەوێڵەو چەوساندنەوەی جوتیار هەڵدەدەن هەروەك لە کەس نەسەلمێ بڵێ گەنم چاندو ماشی لێ ڕوا، وەیا فلانم فێری ئاشەوانی کردو بو بە مەلا...

لەو باوەڕە مادییەی کە مامۆستا ئەمیر کردویە بە ڕوانگەی مێژوو و کۆمەڵایەتی هیچ یەکێك لە سەرچاوەو دەستوورەکانی ناتوانێ ئاکامی لە یەکدی جودا بگێڕێتەوە بۆ بنەمای هاوچوون، نەتوانینەکەشی یەکسەر لە بەستنەوەی کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتی بە بنەمای مادی مردو و ڕەق‌و تەقەوە هەڵدەدات، بە نمونە دەڵێم، لەو باوەڕەدا کە دەوری گۆڕانی هۆی بەرهەم دەکرێتەوە ماکی گۆڕانی مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی لە پێشەوە دەوری سەربەخۆو کاریگەری مرۆڤەکەی کە دروستکەری هۆیەکەیە پەککەوتە دەکرێت‌و ڕیشی دەدرێتە دەست گاسن‌و تۆڕو ئێسترو نازانم چی، هەر دەڵێی ڕاوکەرەکە عەبدی ڕێویەکەیە قەبابەکەش بەردەستی مەڕو بزنەکە، هیچ شیکردنەوەیەکی فەلسەفی وەیا "زانستی!" ناتوانێ تەفسیری مێژوو و کۆمەڵایەتی بکات ئەگەر دەوری یەکەم‌و هەرەگرنگ لەوەدا نەداتەوە بە مرۆڤەکە خۆی کە هەر خۆی خاوەن‌و خالقی هەردوکیانە: دەبێ مێژوو لە گاڕەش‌و داسن‌و خەرەك بستێنێتەوەو بە گاڕەش‌و گازەردییەوە بێدەین بە مرۆڤ، ئنجا تێی دەگەین.

لە بیروباوەڕی مندا کە تا ڕادەیەك لە دەرنەچوونی تەحلیلی مادییەوە زەنەی کردوە، ئەم جیهانەی تێیدادەژین‌و بەسەر دەچین‌و وردە وردە پتری لێ حاڵی دەبین، سەرلەبەری دابەش دەبێ بەسەر سێ کەرتی گردەبڕی لە یەکدی جودا:

١-جیهانی مادەی مردو "سروشت" بەخۆی‌و دەستوورە ئەزەلی‌و ئەبەدیە نەگۆڕاوەکانی کە لەوێدا زانینی "ڕوداو" بەند دەبێ بە زانینی ئەو عامیلانەی تێیدا بەشدار دەبن چونکە هیچ یەکێك لەو عامیلانە نە دەزانێ توورە بێت‌و نە دەزانێ بیەوێ‌و نەیەوێ‌و نە لە دەستی دێ خۆگیری وەیا پەلە بکات.. هەموویان "امر واقع"ن‌و بە شێوەیەکی ئالەتی بێ گۆڕان‌و بێ هەڵەو بێ هەست‌و بێ زانین‌و بێ خواییشت کار دەکەن یا ناکەن، تەحلیلی مادی تەنها بۆ ئەم جیهانە مادییە بێگیان‌و بێخواییشتە دەست دەکات کە هیچ کەلەبەری تێدا ناهێڵێتەوەو ئاکامی پێشەکیەکانی لە سەرەتاوە ڕوونە. لەو جیهانەدا "عرض" بەندە بە "ماهیە" وەك ئەوەی کە ماهیەتی "$H_2O$" هەمیشە یەك جۆر "عرض" بە دەستەوە دەدات چ لە کوردستان‌و چ لە ژاپۆنستان‌و چ لە فەڕەنگستان بێ هەر کەسێك‌و هەر نەزەرییەك بیەوێ پەراوێزی شیکردنەوەی مادی پان بکاتەوە تا باوەش بە غەیری مادەی مردوودا بگرێت شەڕ بە واقیع دەفرۆشێ‌و دەیەوێ بە زۆرەملێ زیندو و مردو، هۆشیارو بێهۆش یەکسان بکات.

٢-جیهانی گیانەوەر "حیوان، دواتر بەکزی ڕوەك" کە لەوێدا بایی نوێبوونی کاریگەری "گیان-زیندوەتی" لە چاو کاریگەری مادەی مردوو تەفاوت لە "عرض"ەکانی یەك ماهیەتی زیندوەتی پەیدا دەبێ، بەڵام تەفاوتێکی ئەوتۆیە لە پلە سەرەتاکانی "گیانلەبەری" دا ڕەنگە بە ئاستەم هەستی پێ بکرێ، لزومیش نابینم لێرەدا جوداوازی نێوان ڕوەك‌و زیندەوەر باس بکەم چونکە پەکی لەسەر نەکەوتوە.

٣-جیهانی "هۆشلەبەر" کە بریتییە لە "مرۆڤ" کاریگەری "مرۆڤایەتی" بە تەواوی‌و لە هەموو ڕوویەکەوە جودایە.

سەرچاوە:

بۆ ئەمیری حەسەن پور، لەهەرکوێیەك بێت، مەسعود محەمەد، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ١٩٨٤.

# ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە

له ژماره "٧٦"ی ڕۆشنبیری نوێی ئەیلولی ١٩٧٩ گۆتارەکەی د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف بە ناونیشانی "با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بکرێن" گەلێك بیروڕای ئەوتۆی تێدا هەن کە نوسەران و خاوەن ڕایان بخەنە سەر لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەو ئەندێشەش. لێرەدا من بە پێی بۆچوونی خۆم و لە ڕوانگەی ڕوناککردنەوەوە دوو خاڵی ئەو گوتارە سوودبەخشە دەدەمە بەر لێدوان، ئەوەندەی بشتوانم پێڕەوی ئامۆژگاریەکەی نووسەر دەکەم لەوەدا کە دەبێ لێکۆڵینەوە بە ڕێبازی ڕاست و ڕەوانی زانستکارانەدا بڕوات، هەر نەبێ بایی ئەوەندەی کە دڵگەرمی و عاتیفەی تێدا بەکار نەیەت.

خاڵی یەکەم ئەوەیە کە لە لاپەڕە ١١ی گۆڤارەکە لە بارەی وشەی "ئینعدام"ی عەرەبییەوە هاتوە، کە گۆیا کاتی خۆی کۆنە ئەنجومەنی کۆنە کۆڕی زانیاری کورد بە هەڵە وشەی "نەمان"ی بۆ پێشنیار کردوە.

وشەی "انعدام" ئەوە دەگەیەنێ کە نەبوون بەسەر بونەوەرێکدا بێت ئیتر مادی بێ ئەو بوونەوەرە یا مەعنەوی، وەك کە دەگوترێ "انعدام الوزن" دیارە "وزن" لەسەر زەوی هەیەو هەبوە بەڵام لە دووڕایی هێندە کیلۆمەترە "انعدام" دەکات کە ئەمە پاتەوپات "نەمان" دەگەیەنێ. ئەوەی ئاشکرایە لە "فقه اللغه" ئەوەیە کە فیعل لێی زیاد کرا پتر بەرەو تەئکیدی "ڕوودان" دەڕوات و لە ئیحتیمالی واتای "مطلق" دوورتر دەکەوێتەوە، فیعلی "انعدام"یش کە (مطاوع)ی فیعلی (عدم)ە بە درەنگتر خۆ بەدەست ئەو واتا موتلەقەوە دەدات کە لە وشەی "عدم" وەردەگیرێت. دیارە لە کوردیشدا "نەمان" پتر خزمە لەگەڵ ڕوودان هەرچەندە فیعلەکەشی لێی زیاد نەکراوە، بۆیە نەمان ڕێکتر دێت بۆ "انعدام" وەك کە "نەبوون" بۆ "عدم" دەست دەدات. وشەی "نەبوونی"ش هەر ئەو واتایەی "فقر، عوز"ی هەیە کە د. ئاوڕەحمان بۆی چوە، وشەکەش لە ڕێی ڕاستە دەستووراتی وشەسازییەوە پەیدا نەبوە بەڵکو داڕشتنێکی ڕەمەکییە کە هاتوە "ی"ی ئامرازی ئەبستراکتی خستۆتە پاڵ "نەبوون"ەوە کە ئەویش هەر ئەبستراکتە. ئەم داڕشتنە ڕیزپەڕە (شاذ) ناشێ ببێتە بنەمای دەستوری زاراوەسازی، ئەگینا صەد وشەی وەکو "نەخوێندنی، نەچوونی، نەبیستنی.." دەهاتە ناو ئاخاوتن‌و نوسینی کوردی و زمانەکەی دەشێواند. وشەی ڕێزپەڕ لە کوردی و غەیری کوردی‌دا زاوزێ ناکات، ئەگەر بکات زۆڵ دەهێنێت.

لە بارەی "نەبوونی"یەوە نەك ئەوەندەو بەس، بگرە جارێ هۆی هەرەگەورەی دەستنەدانی لە بری "انعدام"ماوە ڕوون بکرێتەوە:

وشەی "نەبوونی" لە فیعلی "بوون" بە واتای "وجود"ەوە نەهاتوە بەڵکو لە "هەبوون"ی بە واتای "تملك"ەوە وەرگیراوە.

"هەبوون"ی بەواتای "تملك" چونکە تێپەڕە لە گەرداندا خۆی لە هەبوونی بەواتای "وجود" جودا دەکاتەوە ڕاناوی تێپەڕیش لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. لە پێشەوە لیستەی گەردانی "هەبوونی"ی بە واتای "وجود" دەنووسم:

| | |
|---|---|
| من هەم | من هەبووم |
| تۆ هەیت | تۆ هەبوویت |
| ئەو هەیە | هەبوو |
| ئێمە هەین | ئێمە هەبووین |
| ئێوە هەن | ئێوە هەبوون |
| ئەوان هەن | ئەوان هەبوون |

ئنجا لیستەی "هەبوون"ەکەی تملك:

| | |
|---|---|
| من هەمە، هەیتم | من هەمبوو |
| تۆ هەتە، هەیتت | تۆ هەتبوو |
| ئەو هەیەتی | ئەو هەیبوو |
| ئێمە هەمانە، هەیتمان | ئێمە هەمانبوو |
| ئێوە هەتانە، هەیەتتان | ئێوە هەتانبوو |

ئەم ڕێژەیەی (هەمە. هەیتم..)ی (تملك)ە کێشەی زۆر بەدوادا دێت بە نموونە کە دەڵێت (هەیتم) مەبەستت کاتی ئێستاکەیە کەچی ڕێژەکەی وەك (خواردوەتم، کردوەتم)ە کە جۆرێکە لە ڕابردوو. دیسان (هەمبوو، هەتانبوو..) کە ڕێژەی رابردوە جودا بۆتەوە لە ڕێژەی ڕابردووی تێپەڕی عادەتی کە دەڵێت "خواردبوومان، کردبوومان.." هەر بۆیە ئەوەی تازە کوردی فێر دەبی دەڵێ "هەبوومان.." ئنجا موزاریعی "هەبوون"یش بە هەردو واتا کێشە هەڵدەگرێ کە دێت ڕێژەی موزاریعی سادە وەردەگرێ:

من هەم من دەبم

لە موزاریعی (هەمە، هەیتم)دا کێشەکە گەورەتر دەبی کە دێت و ڕێژەی "انتقالی پیچەوانە" وەردەگرێ من هەمە، هەیتم من دەمبێ.

ئەم "انتقالی پێچەوانە"یە لە کتێبۆڵکەی "چەند حەشارگە.."دا بۆ یەکەم جار باس کراوە، بەڵام زۆر پێویستی بە شەرح و ڕوون کردنەوە هەیە، ئێرەش جێگەی نییە:

وا دەزانم کەرتی "هە" لە وشەی "هەبوون" ی بە واتای "تملك" خزمی avoirی فەرەنسی و haveی ئینگلیزییە بەو پێیە ڕەنگە لە کۆندا "هەڤ بوون" بووبێت، بە واتای "وجود"یش لە "هست"ی فارسی و estی فەرەنسی و isی ئینگلیزییەوە نزیکە. لەهجە هەیە لە کوردیدا لە جیاتی (هەیە) دەڵێ (هەس).

بە هەمە حاڵ "نەبوونی" لە بنەڕەتدا "نەهەبوونی" بوە و لێی سواوە، ئێستاش دەگوترێ "هەبوونی و نەبوونی- کابرا بابایەکی هەبووە..".

لەمەوە دەردەکەوێ کە بە هیچ کلۆجێك ناشێ "هەبوونی" بۆ لای "وجود" ببرێتەوە، ئەم ڕواڵەتە چاوغەڵەتێنەی لەیەکچوونی دوو وشەکەش ناشێ تەلەزگە بە بیرمان بکات و لاتریزەمان پێ ببەستێ بۆ دەرەوەی ڕاستە ڕێگەی زمانناسی و زاراوەسازی.

خاڵی دوەم ئەوەیە کە لە لاپەڕە ١٤ی گۆڤارەکەدا وا ڕانوێنراوە کە "ن"ی چاوگ بە کۆتایی فیعلی وەك "کردن، ڕستن"ەوە نانووسێت، گۆیا کورتە بزوێنێکی ورد دێتە نێوان کۆتایی فیعلەکان و نیشانەی چاوگەکەیانەوە بەڵام لە ڕێنووسی کوردی کە بە پیتی عەرەبی دەنووسرێ بزوێنەکە وێنەی بۆ دانەنراوە ئیتر زمانناسان هەڵەی تێدا دەکەن، یانی ئەگەر کوردی بە پیتی لاتینی بنووسرێ نیشانە بۆ بزوێنەکە بەکاردێت و هەڵەی تێدا ناکرێ.

با لە پێشەوە ئەوە بڵێم، نوسینی لاتینیش وا دەبێ سەر لە نوسەر و لێکۆڵەرەوەی کورد دەشێوێنێت وەك کە دێت و لە بری "ئا، ئۆ، ئی..." تەنها یەك پیت دەنووسێت کەچی هەریەکەیان بریتیە لە دوو دەنگی سەربەخۆی تەواو و چ فەرقێك نییە لە نێوان "دا، دۆ، دی" و "ئا، ئۆ، ئی" لە ڕووی ژمارەی دەنگەکانیانەوە، نووسینی لاتینی کە بایەخی بە دەنگی "همزە" نەداوە و لەوەشدا سەهوێکی زلی کردوە، کێشەی بۆ ئێمەش ناوەتەوە کە بەشێکی بەرچاوی لێکۆڵەرەوەی کورد بە شوێن هەنگاوی ئەو سەهوەدا دەڕۆن و دەمەتەقە لەسەر بایەخی دەنگی "همزە" هەڵدەستێت و دانەنانی نیشانە بۆ هەمزە لە نوسینی کوردیدا بە ڕاست دەزانن کەچی دەنگێکی زێدە ڕەسەن و کۆنی زمانەکەمانە، هەر ئەوەندە هەیە لە ئاخاوتنی ئێستاکەماندا هەمزە لەناو توێژی وشەدا نەماوەو بە زۆری لە بەرایی وشەوە دێت، تەنها لە ڕێژەی موزاریع و ئەمر نەبێ وەك: دەئاخێوێ، دەتئەزموم.. لە کوردیدا دەنگی لامی قەڵەویش لە بەرایی وشەوە نایەت کەسیش ناڵێ با نیشانەی بۆ دانەندرێت. دەنگی (ه)ش بە دەگمەن لە ناو توێژی وشەدا (دەبیستریێ) (نهۆم، نهۆ..). ڕەنگە لە ئاخاوتنی ئێستاماندا هەرگیز نەچێتە کۆتایی وشەوە. مەشورترین وشەی کۆنمان "دئاك" هەمزەی لە هەناودا هەیە.. نووسینی لاتینی کە نیشانەی بۆ ئەو دەنگە کز و بێ هێزەی نێوان فیعلو "ن"ی چاوگ داناوە سەرلەنوی وای کردوە بایەخەکی لە ڕادەبەدەر بەو دەنگە بدرێ، ڕەنگ بوو ئەگەر نووسینی لاتینی لێی بێدەنگ بایە ئەویش وەك "همزە" پشتگوێ خرابایە. هەرچۆنێك بێ ئەم دەمەتەقەیە لەسەر "تاوانی ڕێنووس" مەبەستی ئێرەکانە نییە، ئەوەی من بەچاوی خۆمەوە گرتوە لێرەدا شتێکی دیکەیە: ئایا ئەو دەنگە کزەی کە لە نێوان "ت،ن" و "د،ن"ی دوو فیعلی "بەستن، کردن"دایە ئەویش وەك دەنگەکانی دیکەی فیعلەکان "ب، ه، س، ت، ك، ر، د" بەشێکی بنجی و پێکهێنەری وشەیە یاخود شتێکی دیکەیە؟ هەڵبەت هەموو کەس هەست بەو دەنگە کزە دەکات لەو شوێنەو لە گەلێك شوێنی تریشدا، کەواتە بابەتی لێکۆڵینەوە بوون و نەبوونی دیاردەکە نییە بەڵکو (ماهیە)ی دیاردەکەیە پرسیارمان لێرەدا : "ئایا هەیە؟" نییە بەڵکو "ئایا چییە؟"یە.

بە نیازی خۆ ڕونکردنەوەو گوتار کورتکردنەوە وشەی نمونان کە بە پیتی لاتینی بنوسم لە بری ئەو بزوێنە بێهێزە (ı)ی بی نوختە دادەنێم، بۆ کورتە بزوێنی "ی-کەسرەی عەرەبی"ش پیتی (i)ی نوختەدار دادەنێم، لە جیاتی کورتە بزوێنی فەتحەش "e" دەنووسم بۆ "ی"ی درێژیش، لە هەرکوێیەك بێت "y" دەنووسم/ لە جیاتی "کورتە بزوێنی بێهێز"یش تەنها وشەی "بێهێز" بەکار دەهێنم. هەرجارەش بە پێی پێویست بڕگەی وشان لە یەکدی جودا دەکەمەوە تاکو دەوری ئەو بێهێزە لە پێکهێنانی بڕگە کەرتکردنی وشە ئاشکراتر بێت.

لە چاوگی "ڕستن، کردن"دا ئەگەر بڵێین ئەو بێهێزەی پێش "ن"ی چاوگەکان بەشێکی پێك هێنەری وشەکانە ئایا دەبی بە "ن"ی چاوگی بدەین یا بە قەدی فیعلەکە؟ دیارە ئەو بێهێزە هی قەدی فیعل نییە چونکە لە چاوگ قەدی فیعلەکە دەمێنێتەوە بێئەوەی هیچی بێهێز و بەهێزی بە دواوە بێت وەك:

مردن

Mird mir-din

ڕۆیشتن

Ro-yisht ro-yish-tin

نمونەی تێپەڕم نەهێنا چونکە بە لادانی نوونی چاوگ ڕاناوی فاعیل دێت و مەسەلەکە ڕوون نابێتەوە.

کەواتە دەمێنێتەوە (ن)ی چاوگ بێهێزەکەی لە قەبەڵ بکەین. ساغکردنەوەی ئەم لایەنە نەختێك پشوی درێژی دەوێ:

(ن)ی چاوگ هەر لە دوای (د، ت)وە نایەت، بە دوای (ا، و، ی) شدا دێت وەك (فەرمون، زانین، کێڵان). لێرەشدا ئاشکرایە، هاتنی ئەو بێهێزە لەدوای بزوێنەکانی (و، ی، ا) موستەحیلە، چونکە بزوێن هەر کۆنسنانتی بەدوادا دێت، بێهێزەکەش کۆنستانت نییە. کەواتە دەرکەوتنی ئەو بێهێزە لە چاوگاندا هەر لە چاوگی دالی و تێیی دا مومکینە.

ئێستا قەدی فیعل دەدەینە ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ و دەڵێین: (کردمان، kir-di-man) دەبینین هەمان بێهێز لە بەرایی ڕاناوەکەشدا هات وەك کە لە پێش (ن)ی چاوگدا هات، ئیتر هەمان پرسیار هەڵدەستێ لەوەدا ئایا ئەو بێهێزە بەشێکی ڕاناوەکەیە؟ خۆ

# نامەکانی مەسعود محەمەد

**ئا: حەکیم کاکەوەیس**
**سوێد**

ئەگەر نوسەر بمرێ، ئەگەر لە نوسین کەوت دەمرێ، ئەگەر خۆی سووك کرد دەمرێ، ئەگەر ڕای خۆی بفرۆشێ دەمرێ، ئەگەر دوو ڕوویی کرد دەمرێ و ئەگەر جنێوفرۆش بێ دەمرێ. خۆ ئەگەر لە یەکێ لەمانەدا، جگە لە حاڵەتی یەکەم، نەمرد، دەبێ خوێنەران بیمرێنن، دەنا بەخۆیان دەمرن.

مامۆستای گەورەو خۆشەویست، بەڕێز کاك مەسعود دوای عەرزی سڵاو، هیوای لەشساغی و خۆشیتان دەخوازم.

چەند ڕۆژێ لەمەوبەر، نامەی ١٩/١١/١٩٩٤تان سەهۆڵبەندانی شاری (ییڤلە- )ی کردمە گوڵزار و بەهار. وەڵامەکەیم نووسی و چاوەڕێی دەرفەتێ بووم بەشی دووەمی قەواڵەکانی هەورامان کۆیی بکەم و بیکەمە هاوڕێی. ئەمڕۆش نامەی ٢٥/١١/١٩٩٤ تان گەیشت و گەلێ لە ناوەڕۆکی نامەکەمی پووچاندەوە، بۆیە وا پەنا بە خوا ئەم نامەیەی لە جێدا دەنێرم.

کە باسی کۆمەدینەی لای چەپی قەرەوەیڵەکەتان کردووە نامەکەی منی لەسەر بووە- ئەو فیلمە دۆکیۆمێنتەم بیرکەوتەوە کە جەنابتی پێشان دەدا: مامۆستای گەورە، کلێتەیەکی لەسەر بوو، بە ڕۆبێکەوە لەسەر قەرەوێڵەکە، چوارمشقی دانیشتبوو و دەوروبەری کتێب و دەفتەر و شتی تر بوو، پێم وایە لە (شخصیات عراقیە)دا ئەوەم دیت... وەك دیمەن، ئەوەم بەلاوە زۆر جوان بوو بۆیە بیرم ناچێتەوە.

ئەو (عەقد)و شایەدی و مەرج و مەرجکارییانەی کە لە قەواڵە کۆنەکاندا هاتوون، بە بێ دوودڵی دەڵێم لەم (هەیبەڵێ)یەی ئەمڕۆ چەندین جار چاکترن. دەستوور و سنوور و مەرج هی هەرکێ بن، پێم وایە لە بزووتنەوەی عەشوائی ئەمیبەیی بێ سەر و بەر چاکترە، بە تایبەتی کەس نەزانێ کامە تاشەبەرد ئەنجام و ئامانجی خۆپێداکێشانێتی. خەڵکانێك ئەو دەمە، ئەوەندە بە دەستوور و سەلیقە بن، بۆ دەبێ لە بری بەرەوپێشچوون سەد فەرسەخ دوا بکەون؟.

نازانم مێژووەکەی (مەردۆخی)تان دیوە یا نە. لە لاپەڕە ٩٣ی ئەو کتێبەدا شیعرێك هاتووە، لە ناخەوە هەژاندمی هەرچەندە لەسەر باوەڕی نەیارەکانیشیانم. پێم خۆشە بۆ دڵنیایی دەقەکەیتان بۆ بنووسم:

هورمزگان ڕەمان ئاتیران کوژان
وێشان شاردەوە گۆرە گۆرەکان
زۆرکار ئارەب کرتە خاپوور
گەنا و پاڵە هەتا شارەزوور
شینۆ کێنکان وەدیل بشینیا
مێرد ئازا تای ژە هوێنیان
ڕەوشت زەردەشت مانەوە بێ کەس
بەز بیکار نیکا هورمز و هویچکەس

من بڵێم چی کە خەڵکی بەر لە هەزار ساڵ توانیویانە ڕاستەوخۆ دەردی خۆیان دەربڕن کەچی (بلیمەت)ی ئەمڕۆمان باسی کۆریا و دیوی ئەودیوی کێوی قاف بکات، کەچی بن پێی بە سووتماککراوی خۆی فەرق نەکات.

مامۆستا گیان: من گەلەییم لە نوسینی وردتان نییە و زۆر چاکم پێ دەخوێنرێتەوە. گلەیی من لەو کارگەیە کە قاقەزەکانی دروست کردووە.. خەتی کاغەزەکە لە یەکەوە زیاد زیاد لە پێویست نزیکن و خۆزگەی ئەوە دەخوازم ئەو خەتانە کەمێ خۆیان لە یەك دوور بخەنەوە. جگە لەو گلەییە، گەلەیی هەرە زانیبێتی باسی کەمحوکمیی چاو بکات!. هیوادارم خودا پشتوپەناتان بێ و زوو بتوانن ئەو هەڵانە ڕاست بکەنەوە کە پەڕیونەتە تویێی (گەشتی

ژیانم)و مەودای ئەوەش هەبێ هێندێ مەتەڵی لێ ئاشکرا بکرێ و بکەونە بەر دەست.

لەگەڵ ئەم نامەیەدا، بەشی دووەمی (قەواڵە کۆنەکان...) تان بە جیا بۆ دەنێرم و ژمارەیەکی تری (سروە)ش. نازانم (سروە)کەی دی گەیشت یا خێر.. لە نامەکاندا باسیان نەهاتووە.

پێم خۆشە مامۆستا مەسعود هەر وەك قوتابییەکی خۆی تەماشام نەکات، بەڵکو لایەکی لاوکانەشم لێ بە لادا بکاتەوە و پێم بڵێ چ پێویستییەکی هەیە. زۆر مافی باوکی خۆمم لە سەرەو بێ هودە هەوڵ دەدەم تۆڵەیان بکەمەوە. ئەی مافی ئێوەم بە سەرەوە نییە؟. زنجیرە گوتارەکانی (العراق)م خستوونەتە دەفتەرێکی تایبەتییەوە و داخەکەم یەك دوو کەلێنیان تێکەوتووە. ئەهلی چاپیش، جار و بار بە کەیفی خۆیان کردووە..

هیوای لەشساغی و سەرکەوتنتان دووبارە دەکەمەوە و خودا یار و یاوەرتان بێت.

برابچووکتان حەکیم

١٩٩٤/١٢/٨

کاکە حەکیم

لە ئێستاوە ساڵی نوێی دوای چەند ڕۆژێکت لێ موبارەك بێت، مانیع نییە لە منیش موبارەك.

ئەمڕۆکە نامەی ١٩٩٤/١٢/٨ت گەیشت هەروەها گۆڤاری سروە.. هەرچی پێشتریش ناردووتە و ناویانت بردووە لە نامەکانت هەمووی گەیشتووە: لە بارەی قەباڵەکانی هەورامانەوەو ئەو بڕە شیعرەی تێچینی نامەی تازەت کردبوو ڕای جودا و لێك دوور هەن. ئەو قەباڵانە بە ئاسانی ناکرێنەماڵی کورد. زمانێ پێی نووسراوە خراوەتە بەر نیگای گەورەترین کۆنەخوێن و نامەکانی جیهانەوە.. کوردیش لەو دەمەی ئەشکانیەکان فەرمانڕەوا بوون نە دەسەلاتی لە دەستدا بووە نە هیچی لێ بەجێ ماوە لە نووسین و کەلەپووری وەك نەقشی زەق و ئارایشی دەوری جام و قاپ و نگین و نازانم چی. پێی ناوی بڵێم لە خۆوە دیارە نووسینی سەربەخۆی نەبووە هەر نەشیبوو هەتا سەردەمە تازەکانی خۆناسینی ئەویش بە پیتی عەرەبی یان لاتینی. ئەوەی بە هاراوی ئەو قەباڵانەوە ڕۆیشتووە گۆیە زمانەکەی کە بە کوردی لە قەڵەم بدرێت پەهلەوییە کە زمانی پارسەکان ئەشکانیەکان بوو خۆت دەزانیت (پەرسەوی) بۆتە (پەهلەوی) وەك من لە کتێبانم خوێندۆتەوە.. شیعرەکانیش لە گوماندان چونکە چ نموونەی دیکەی متمانەبەخش لە کوردی بەر لە ١٣٧٠ ساڵ لە دەستدا نییە ئەم شیعرەی پێ بگیرێت: هەتا دەتوانین بڵێین ئامرازی ناساندن (تعریف)ی ئەوسا هەمان (ەکە-ەکان)ی ئەم سەردەمە ناسراوانەی ئەمڕۆکە بوو لێکۆڵینەوەیەکی خستوخۆڵی دەوێت.. بۆ دەبێ شێوەی کوردی ئەو سەردەمە کۆنە چ وێچوونی نەبێ لەگەڵ شێوەی بابان، سۆران، موکریان، کرمانجی سەروو تەنها خزمی شێوەی هەورامی بێت؟ زۆریشم بیستووە هەورامی لە پەهلەوییەوە نزیکە تەنانەت قوتابی کوردی هەورامانی زمان لە هەوەڵ خوێندنی دەرسی سەر بە زمانی پەهلەوی (لە زانکۆیەکی ئەمەریکا) بە ڕەهایی ئەغڵەب وشەکانی نێو کتێبی ئەو دەرسەی زانیبوو- بە هەرحاڵ، جارێ بڕیاردان لەسەر ئەو مەسلانە (بە پێی ئارەزوی کورد) کاتی پێ دەوێت.

پێداچوونەوەی گەشتی ژیانم ماوەی هەرە زۆری بڕیوە.. ئێستا خەریکم لەسەر تەکلیفی مامۆستای شاکەلی و هەڤاڵانی (من هموم الحیاه) وەردەگێڕمە سەر کوردی.. ئەمما های گرانە و نە گەمە، بەڵام پێی دەوێرم. لەو دوو سێ ڕۆژەی ڕابردوودا ٧-٨ لاپەڕەیەکم تەرجەمە کردووە ڕازیم لێی. ویستم تەکلیف لە یەکێکی شارەزای عەرەبی و کوردی بێت بکەم ئیشەکە بە ملەوە بگرێت چونکە لەو بەینانەدا مەشغەڵەتی سەر بە نووسین و سەقافەت و نامەنووسین و شتی ئەوتۆیی مەیلەو بێ وەقتی کردووم بەڵام وەرام هەر ئەوە بوو کە دەیانگوت: بە خۆت نەبێ بە کەس ناکرێ.. ڕەنگە ڕاستیشیان کردبێ. تۆ بڵێ ئەم عیبارەتە (و من تحصیل حاصل القول ان الشرق الاول والاجل للابوة هو تحقیق مقتضاها من زیادة الایمان بمطلق الرحمة ومضاعفة الكرة لمطلق العدوان) چ قاڵبێکی کوردی بەخۆیەوە دەگرێت؟. یان ئەم دێڕە: (تمتلئ الجوانح بالطمانینة والرضا و تنبسط ملكوت الحق والجمال الی مدة تنقطع دونة قابلیة انبساط الذات علی مقاسه) ئەمانە نموونە بوون لە هەوەڵ بابەتی لە سی بابەتی ناو کتێبەکەیە لە ژێر سەرناوی (حوار غیر متکافئ مع الحرب) پەنا بە خوا! دەزانم ماندووم دەکا بەڵام کۆڵم پێ نادات.ئەوەی بە (شخصیات عراقیه) دێتەوە یادت پێی دەگوترا (سیرە و ذکریات). ڕێکخەر و بەرپرسی بەرنامەکە بە هەوەڵ سەردانی لێم گوتی دوو ساڵە ناوی تۆم لایە.. ئەم جارەیان لە هەورازەوە سەفارش کرا کە لە گەڵت بدوێم و هەرچی دەشێلێی قەبووڵە.. بەرنامە یەك سەعاتی بوو، وتووێژمان ٣٥ دەقیقەی لە سەعاتێك پتر خایاند بەڵام هەر سەعاتێکی لێ بلاو کرایەوە.. سەیر ئەوە بوو ٧ مانگ و ڕۆژێکی پێ چوو ئینجا بڵاوکرایەوە.. شەوی بەرنامەکە هەر ئەوەندەی بەرنامەکە کۆتایی هات تەلەفۆنات دەستی پێ کرد بۆ ماڵەوەم لە بەغداو دەرەوەی بەغداش.. سەرۆك کۆمار ئەمری بە وەزیری ئیعلام کرد بێتە لام لە وەکالەتی ئەو، چ ئیشێکی هەمبێت بە تایبەتی لەلایەن نووسین و چاپکردن و ئەو شتانەوە.. ئەو دەمە دوو کتێبم لە ژێر چاپ بوو ٥-٦ هەزار دیناریان مەسرەف

بوو وەزارەتی ئیعلام بە خۆیەوە گرت. بەر لە چەند ڕۆژێك لەلایەن تەلەفزیۆن پەیوەندیم پێوە کرا بۆ دیدەنییەکی ئەدەبی لە گەڵم بدوێن.. ڕۆژی وەعدە نەختێك ناساغیم هەبوو نەمتوانی بۆی بچم ڕەنگە بەم نزیکانە بە سۆراغیەوە بێنەوە (وەك کە پێم گوتراوە) ناوێکی باوك و ئەولادەتیت هێنابوو: من هەتا ئێستاش کە کوڕی دووەمم سیی ساڵییە مووچانەی دەدەمێ، ئەو لە هەولێر من لە بەغدا بەخێر ئەگەر پەڕوباڵت لێ ڕوا و پەڕەوازە بوویت چ قەیدی هەیە وەکو چۆلەکە دەنکە تۆوێك، دانە گەنمێك بخەیتە دەممەوە.. شوکرێ ئێستا لە بەغدا نەفەرێك کەباب گەیشتە ٣٥٠ دینار. سواڵکەر بە ٢٥ دینار ڕازی نییە. مانگانە حکومەت بژێوێکی مناسب دەدات وەك خۆڕایی بێت ١/١٠٠ی نرخەکەی وەردەگرێت یان کەمتریش خەڵکە بەوەوە دەژیت.. نەوت و گاز زۆر هەرزانە.. کارەبا لە چاو حاڵ مەیلەو بەلاشە. ئاخر قەسیمەی کارەبا مەسرەفی ٥٨ ڕۆژی هاوینە ٣٤,٥ دینارە. دەڵێن نەختێك گرانتر بووە. ئەمما هێلکەی تەرەس تەبەقی ٣٠ هێلکەیی بە ١٣٠٠ دینارە یان پتر.. گۆشت لە کەبابەکەوە دیارە زۆر گرانە. تەلەفۆن ئەگەر لەگەل دەرەوە قسە نەکرێ هەرزانە. مەعاشی تەقاعودیم دەوری ٢٨٠ دیناری مانگانەیە. نووسین بە نرخێرا دیارە بێ حورمەتە. لەگەل من تێبینی دەکەن. جەریدەی (العراق) بۆ ئەو چوار کورتە نووسینەم ١٥٠٠ دیناری مانگانەی داناوە کە بەلای کەمەوە دوو هێندەی مزەی نووسەری دیکەیە کە کاتی خۆی ١٥٠٠ داندرا بەلای کەمەوە ٤٥٠٠ دیناری ئێستاکەی دەگرتەوە. خولاسە دەیگوزەرێنین. برادەرانی ئەورووپا لە پاداشتی نووسینم یارمەتیم بۆ دەنێرن بی ئەوەی من لە سەرەتاوە داوای شتێکم کردبێت.. ئێستا باری گوزەران گۆڕاوە: نووسینێکی ناچارم بکات دوو مانگ و سێ مانگ پێوە خەریك بم، بێ یارمەتی، پەکی بەشێکی بژێو و مەشغەڵەتم دەیەخێت چونکە کاری دیکەم پێ ناکرێت لەگەڵ ئەو مەشغەڵەتە.. نەکەی ئەم قسانەم بە ئاه و نزا وەربگریت: حەقیقەتێکە و مناسەبە هێنایە ناو نوسینەوە.

خەتەکەم و مەودای تەسکی نێوان دێڕەکانم لێم بوون بە شەقل. ساڵەو ساڵ بە پێی قوڵ داگرتنی بیرکردنەوەو وردتربوونەوە خەتیشم ورد دەبێت. بڕوا بکە ئەگەر زۆر لە خۆم بکەم بۆ درشتکردنی پیتەکان نووسینەکەم زۆر ناقۆڵا (لە لایەن واتا و داڕشتنەوە) دەردەچێت. جاران وەها نەبووم: هەندێ نوسخەی کۆنە نووسینم ماون دەڵێی بە قەڵافەت باوکی نووسینی ئێستاکەمن. بە هەمەحاڵ دەروەستی تەبیاتی خۆم نایەم.

قسە درێژی خایاند. لەبەر مەشغەڵەتی تەرجەمەو نووسینی دیکەی ناچاری، لە سەرەتاوە نیازم بوو بە کورتی وەرامت بدەمەوە. قەیدی نییە تەحەموولم بکە.

ئەو شارەی Gavle کە تۆ بە حینجەی خۆمان (یێڤلە)ت لێ کردووە بە ناو من هەر بە (گاڤل)م دەخوێندەوە. پێم بڵێ Norrkoping و Nykopingچۆن دەخوێندرێنەوە. من زۆر حەز لە سەیری خەریتەی ڕێکوپێك بە تەفصیل و نفوسی شارەکان و ڕێوبان و هەموو سەروبەرێکی دەکەم. ئەتڵەسی Britanicaم لایە جگە لە یەکێکی کۆنتر کە فەرقی نفوسی ئەو دوو دەمی خەریتەکان بە دەستەوە دەدەن. گەلێك وردە حیسابی لێ هەڵدێنجم (لە بەریتانیکا) تەنانەت لە تێبینی ئەو ڕێگە شەمەندەفەرانەی کە لە زۆر شاری ئەفریقادا بە ناتەواوی ماونەتەوە ئاشکرایە کە ناتەواویەکە هی استقلالی ئەو وڵاتانەی هەتا ئەوروپایی لێ بوون ئەو پڕۆژانە لە پێشکەوتندا بوون.. شارێکی وەکو کەلکەتەی هند ١٦ خەتی شەمندەفەری لێوە دەڕوات هیچ نەبێ ١٢ی هی زەمانی ئینگلیزە ئەگەر هەمووی هی ئەوان نەبێت.. خولاسە..!

با لێرەدا ماڵاواییت لێ بکەم شەوم گەیاندە ١,١٥ی دوای نیوەشەو دەبێ خەریکی چوونە ناو نوێن و موتاڵای شەوانە ببم.. لەو بەینە زۆر شەوان هەتا مەلابانگدانی سبەینە بەخەبەرم نان دەخۆم ئنجا دەنووم.. دیارە نانی ئەو دەمە کەسی دیم لەگەڵدا نییە بە شەریك بێت، لەزەتیش لە پێوە خەریکبوونی دەبم کە هەمووی بە ئارەزوم دەبێت نەك ئارەزۆی غەیر. ئیتر بە خەیاڵی هێلکەی کوڵاو و ماستی (البان) و شیرەمەنی دیکە و نەختێك گۆشت (ڕەنگە شفتە بیت) وێڕای کوپە چایەکی خۆماڵی کە لە هاوینی پارەوە هێندەم لەگەڵ خۆم لە هەولێرەوە هێنا، هەموشی تۆچای پەسند، تا ئێستاش بە دەم حصەی حکومەتەوە دەام دەکات.. بەو خەیاڵەوە سلاوی دواییەم تیکەڵ بە مڵچەمڵچی خواردنی کوردانەم دەکەم بەڵکو تامەکەی لە مەڵاشووی تۆش بگەڕێ.. عافێتت بێت.

لە براتەوە

مەسعود محەمەد

١٩٩٤/١٢/٢٦

مامۆستای گەورە و خۆشەویست، بەڕێز کاك مەسعود.

ساڵی نوێ لە ئێوەش پیرۆز و هیوادارم ساڵی خۆشی بێ. نامەی (١٢/٢٦)ی پارتان حەڤدە ڕۆژی لە ساڵی نوێ تێپەڕاندبوو ئەوسا گەورەی کردم و بە گەشکەوە پێشوازیم لێی کرد. هێندێ فەرموودەتان بزەیان دەخستە سەر ئەو لێوانەم کە بە دەگمەن بزە دەکەن. هێندێکیان خەمبارانیان کردم و سەرجەمیشیان وەك هەمیشە زانیاری دەگمەنیان پێ بەخشیم. بزەم بۆ ئەوە بوو کە ویستووتانە تامی نانخواردنی بەیانیتان بە مەڵاشوی منیش بگات و عافێتم بێ.. یا خوا لە گیانتان خۆشبێ و عافێتتان بێ. هەرچەندە شەش حەوت ساڵێك دەبێ و تەرکی چایخواردنەوەم کردووە لە ڕوو

دانـەمێنم بـە لایـدا ناچـم. بـەڵام بـۆنی ئـەو چـایەی کـە دەسـتتان کەوتووە ئارەزووی چاخواردنەوەم دەبزوێنێ، خەمم بۆ ئەوە بوو کە مەعاشی خانەنشینیی مانگێك یەك نان و کەبابی پێ نەیەت، دیارە دەبێ هـەر کەبابچی کەبابی پێ بخورێت!. لـە شام، کابرا دەیگوت: مانگی هەشت سەد لیرە مووچەکەمە و هەزار بە کرێی خانوو دەدەم. (حەمە شێت گوتەنی) ئـەڵڵا بەرەکـەت دا، دووسـەدی دەمێنێ. حەمە شێت هێلکەیەکی بە شەش فلس دەکڕی و دەیدایەوە بە عانەیەك و دەیگوت: ئەڵڵا بەرەکەت دا دوو فلوسی تێدایە.

سەری لـە (طرح و جمع) دەردەچوو بـەڵام قازانج و زەرەری لێك جـودا نـەدەکردەوە. گـەلێ جـار لەگـەڵ برادەرانـی ئێـرەدا باسـی وەرگێڕانـی بەرهەمـە عارەبییـەکانتان دەکرێ. مـن چـۆن ڕام وابـووەو ئێـستاش وایـە کـە قورعـان و شـیعری نـالی تەرجەمـە نـاکرێن بـەڵکو شەرح دەکرێن، ڕام لەسەر وەرگێڕانی بەرهەمە عارەبیەکانی ئێوەش وەهایە. تەرجەمە ناکرێن.. شەرحیش بکرێن هەر بە خۆتـان دەکـرێ. ئـەمما بەرهەمـە کوردییـەکانتان کەسـێ کـە کـوردی و عـارەبی بـە ڕەوانیـی بزانـی ڕەنگـە کوردییـە چـاکەکەی ئێـوەی پـێ بکرێتـە عارەبییەکی مەیلەو باش یا مەعقوول‌و مەقبوول. (من هموم الحیاه) هی وەرگێڕان نییە، بە تایبەتی باسەکەی لەمەڕ مەلای خەتێ. بەڵام یـاخوا بـەخۆتان، بـە کـوردی دایبڕێژنـەوە و داڕشـتنەوە دەڵـێم و حـەزیش دەکـەم نـاوی وەرگێڕانـی لێ نـەنرێ. بە میزاجی من وشـەی (تجسید)ی عارەبی ئەگەر بشکرێتە بەرجەستە، پڕ بە پێستی نابێ.. دەوجا وەرە ئەو دوو ڕستەیە وەرگێڕە کە لە نامەکەتاندا هاتووە! بایەخی پێداچوونەوەی (گەشتی ژیانم) هەر تەواو نابێ، بە تایبەتی هێنـدێ لـە مەتەڵـەکان ئاشـکرا بکـرێن و کەلێنـە چـاپییەکان پـڕ بکرێنەوە و هەڵەی چاپ ڕاست بکرێنەوە.

بەڵێ ئەوەی من بە شریتی ڤیدیۆ دیتم (سیرەو ذکریات) بوو. شەش حەوت ساڵ لەمەوبەر لە ڕێی ئەو شاعیرەوەو چنگم کەوت کە لـە چاوپێکەوتنەکەدا بـە چاکە ناویـان هێنـاوە. ئیـدی دوای ئـەوە مـەودای نێـوان مـن و ئـەو شـاعیرە کـشاو لێـك دابـڕاین و چاوپێکەوتنەکەم نەدیتەوە.

لە نامەکەتان و هەموو هەواڵ و سەرچاوەکانەوە تێگەیشتووم کە چەند باری گوزەرانی گرانـە و بـۆ کەسێکی وەکو ئێوەش گرانتر. دیارە مێوانداریشن‌و بەش بە حاڵی خۆم ئەگەر ڕێم بکەوێتە بەغداو زیـارەتی جـەنابتان نەکـەم دەبم بـە (حـاجی بەغـدای نـەدیوە)ی سلێمانی. مامۆستاو قوتابی، باوك و ئەولادیش لە نێوان بەڕێزتان‌و بەنـدەدا هـەبێ. هـەر دەرفـەتێ برەخسێ چـونکە ئێستا قوڕیـان بـە چـاوی خۆیـان و دەرفـەت دا داوە لـە قـەدەر حـاڵی ئێـستام شـتێ دەنێرم. قەتیش قسەکانی جەنابتان بە بارێکدا لێکنادەمەوە گەرد بنیشێتە سەر پەڕەگوڵی کەسایەتی مامۆستا. خۆزگە دڵتان نەهاتبا بنووسن: نەکەی ئەم قسانەم بە ئاه و نزا وەرگریت.

چ خەی وردنووسین و دێری لێکنزیکتان نەمێنێ چونکە بەهۆی جووتێ چاویلکەی تازەوە کە دوو هەزار کرۆنی ئێرەییان تێچووەو بەینێ لەمەوبەر دەیکردە بیست هەزاری ئەوێ، عەجایب پێیان فەرق دەکەم و چاك پێیان حەساومەتەوە.

بـەڵێ مامۆسـتا: (Gavle) بـە (یێڤلـە) و (Norrkoping) بـە (نۆڕشـۆپینگ) و (Nykoping) بە (نویشۆپینگ) دەخوێندرێنـەوە چونکە ئەگەر حەرفی عیللەی سەرەوژێری وەك (i =ئی) و (e =ئی) و (o =ئـوێ) و (a =ئـێ)– (ێ) یەکـەی هێنـدە قەڵـەوە لـە ئـا نزیـك دەبێتەوە) بە دوای (k)دا بێت دەیکەن بە (ش) و بەدوای (g)دا بێت دەیکەن بە (ی). خۆ کوردیش گۆڕانکاری لەو دوو پیتەدا دەکات‌و لە کوردیـشدا حـەرفی عیللـەی سـەرەوخوار دەنگیـان دەگـۆڕێ. جگـە لـەوەش هێنـدێ قاعیـدەی (سمـاعی)شـیان هەیـە: (Goteborg) دەبێتە (گوێتەبۆری) نەك (یۆتـەبۆرگ) و (borg) یش لـە زمانـەکانی تردا بە (بۆرگ) دەخوێندرێتەوە.

لەبەر ئەوەی ئەرکی گەلێ قورسم بە ئەستۆ کەوتوون هێندێ جار نامـەم دوا دەکـەون. لەلایەکـەوە بـاوکی دوو کـوڕی هـەرزەکارم و هـەرزەکاری ئـەم وڵاتـەش هـەر (یا ستار)ی دەوێ. لە لایـەکی ترەوە ڕۆڵـی دایکیـان بـۆ دەبینـیم و هەمیشەش وەك هـاوڕێ دەبـێ جێـی متمانـەیان بم. هـەردووکیان وەرزشـکاری پێـشکەوتەن و لـە ترسـی لـەڕێ لادان نـەك هـەر پـشتگیرییان دەکـەم بـەڵکو هانیـشیان دەدەم. (ئومێد) کە تەمەنی ١٧ ساڵە پار لە (ملاکمە) یەکەمی لاوانی سوید بوو. (دەوەن)یش تازە تێهەڵچووەو لەناو دەستەی هاوتەمەنی خۆیدا خەریکە پێش دەکەوێ و ئەمیان (١٥) ساڵە. ڕەنگە جێی خۆی بێ بڵێم: کاتی خۆی کاك فریادی ڕەحمەتی پێشنیاری ناوی (دەوەن)ی کرد و منیش زۆرم بە دڵ بوو. ئەرکی ترم ئەوەیە کە لە ماتماتیك و فیزیك و پەروەردەی خۆماڵی و زمانی خۆمان یارمەتییان بدەم جگە لـە (کـوڵ و کـانی)و کاروبـاری مـاڵ و .... و هێنـدێ جـار چاوسـوورکردنەوە ئێـدی ئـەو کاتانـەی کـە دەمێنێتـەوە دەبـی بـۆ خـۆفێرکردن‌و خوێندنـەوەو بـژێو و خـەمی کەسـوکارو هـەموو دنیـا تـەرخانی بکـەم و بـاوەڕ بفـەرموون یـەك دەقیقـە نامێنـێ بـۆ (قلبـی) تەرخان بکەم. هەمووی بۆ (ڕەببـی) دەبێ. بـەڵام ویـژدانم ئاسوودەیە نە گەمە!.

ئیتر بە هیوای خۆشیتان دوعاخوازیی دەکەم

براتان حەکیم

سەرچاوە: www.raman-media.net

# دیدار لەگەڵ مەسعود محەمەد

سازدانی هەڵۆ بەرزنجی

١-فەلسەفەی مرۆڤ بۆتە ئایینزایەکی بەها و پیرۆز لە ژیانتا، ئالەم دیدەوە چاوەڕێی چ ئایندەیەك لە بەردەم مرۆڤایەتیدا دەکەن، بە تایبەت دوای گۆڕانکارییەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی؟

لە بارەی(گۆڕانکاریی ئەم دوایی‌یەوە)کە وا بزانم مەبەستت هەڵوەشانەوەی سۆڤیێتسان و نسکۆی کۆمیونیزمە، من لە ڕۆژانی هەرە زووی ١٩٥٠ و هەرە دوایینی ١٩٤٩ گوتوومە و لە هەندێ نوسینی ئەوسامدا کە مومکین نەبوو بڵاوی بکەمەوە دەرمبڕیوە گوتوومە مارکسیزم ئەگەر تەعدیلاتی بنەڕەتیی تێدا نەکرێت ناشێ بەردەوام بێت چونکە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ و ڕاستییەکانی کۆمەڵایەتیی بێتەئویل ناگونجێت.. دەمێنێتەوە کۆمیونیزم وەك بیروباوەڕێك کە لە مارکسیزمەوە پەیدا بێت، ئا ئەو کۆمیونیزمە بە بەریەوە هەیە ماوەیەکی درێژەدان بژیت نەك لەبەر لایەتی((علمانیە))ی کەوا بێگومان (بە لای منەوە بێگومان) بەشێکی زێدە گرنگی پێوەندیی بە واقیعەوە نییە و پتر بە لای گریمانە(فریچە)و ئارەزۆی خاوەنەیەکدا دەچێتەوە کە ویستوویەتی(چینی ڕەنجدەر) لە نەزەرییەدا بکاتە خاوەنی مێژوو و لە ئایندەدا حوکم بە دەستەوە بگرێت.. یەکێك لە گوتە مەشوورەکانی ئەنگلز کە دەڵێ کارکردن خالقی مرۆیە ڕاستییە هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکەی کۆمەڵایەتیی سەرەوبن کردووە، چونکە مرۆڤ خالقی کردەوەی کۆمەڵایەتییە و کۆمەڵایەتیش بریتییە لە هەموو مێژوو. بە پێی ئەو گوتەیە دەبوو هەموو جانەوەرێك ببێتە مرۆڤ، خۆ مێروولە شەو و ڕۆژ لە هاتوچۆدایە: وا ڕچەی شارەگێرکەیەك بە بەردەمی دەرگای ژووری مندا دێت و دەچێت بە شەویش پشوو نادات، چ ئاگاشی لە عەزابی من نییە بە دەست خۆپاراستن لە شێلانیان... بەر لە پشکوتنی هۆشی مرۆ ئیمکان نەبووە کاری سەر بە کۆمەڵایەتی پەیدا بووبێت... هەر لەم ڕوانگە بەدیهییەوەڕا ئاشکرایە کە قۆناغەکانی مارکسیزم هەڵیناون لەسەر جۆری گوزەران و ئاکامەکەی دەکاتە گەیشتنی چینی ڕەنجدەر بە



حکوومەت، ئا ئەم بیروڕایە ئەفسانەیەکی(وەیا تەڵەیەکی)سیاسییە دەستچێن کراوە لە شوێنی ڕاستییە بێفێڵەکەی قسە هەڵبڕەوەکەی لە چاوچەقیوەکەی کە دەڵێ: بەر بە تێگەڕانی هۆش لە مێشکی مرۆڤ و پەیدا بوونی((زانین))ی هۆشەکیی جودا لە هەستی غەریزی، مومکین نەبووە کردەوەی سەر بە کۆمەڵایەتی و گۆڕانی کۆمەڵایەتی-مێژوویی یەدا ببێت.. قۆناغەکانیش هەر لەو ڕاستییەوە دەبێ بدرێنەوە بە فراژی بوونی بڕشتی هۆش و بیرکردنەوە لە گۆڕینی ئەمڕازی ڕاو و چەکی دیفاع و پرسیار لە حەقیقەتی بوونەوەر پەی بردن بە چاندن و ئاژەڵ کەوی دەکەنز..و..وە هەتا دەگاتە ئەم ڕۆژانە کە خەریکە ترسی ئاتۆم زەندەقی مرۆ ببات... وەرزێر و کرێکار و هەرچی نەخوێندەوەارە چ دەستێکی نەبووە لە داهێنانی نووسین و فەلسفەی و یاسا و هەرچی دیاردەی ژیارییە، وەرزێر لە ٥٠٠٠ ساڵەوە بە دوا کلکی کارەشدا زەوی دادەڕووشێنێ و یەك هەنگاو بەرەو پێشەوە نەچووە و لە مێردەزمە تۆقیوە و شێخۆلکە و شەعبەدەبازی پەرستووە تەنانەت گاسن و داسەکەشی لە شارەوە بۆ دەچوو.. من لێرەدا چیی دیکە بە دوا ئەم شریتە لێکدانەوەیە ناکەوم چونکە لێ ڕەهابوونی و بە کۆتایی گەیشتنی کاری کردەنی نییە و لە نوسینی جۆراوجۆرمدا بەپێی لوان دەوری ئەو باسانە هەڵاتووم هەرچەند پچڕپچڕییش بووبێت..ز شیوعیەت نەك لەبەرلایەنی(علمانیە)بەڵکە لەبەرلایەنی عاتیفە و تاوگیری و

تیژڕۆیی و دەروێشییەکی تێدایە تەمەندرێژتر دەبێت لەوەی خەڵك چاوەڕوانی دەکات، سەیرێکیش لەوەدا نییە چونکە گاپەرستی و بوتپەرستی لە سەردەمی ئاسمانگەڕی گەشە دەکات... کەنیشتەیەکی لەسەر دانهێنان بە سووڕانەوەی زەوی لە دەوری ڕۆژ زانای فەلەکناسی دەسووتاند ئێستا شانازی دەکات بە ناردنی(ئینجیل) بۆ ناو مانگ... با دوور نەڕۆین: ئەگەر شیوعییەت چاوەڕوانی ئەو مەرجانەی کردبایە کە مارکس بۆ هاتنەدیی شیوعییەت بە بنەمای داناون کوردستانە وێرانەکەی خۆمان کە بە هەموو مێژووی کۆن و نوێیەوە نەك بانك بەڵکوو((صراف))ێکی خۆماڵیی بە خۆیەوە نەدیت، چۆناوچۆنی بە مێشکی کرایەوە و چاوی دنیابین جورئەت وە بەر خۆی دەنێ بڵێ شیووعیم: ئەگەر شیووعیەت نەبوو بێتە دین کەی لەسەر بەردەڕەقی قڕنافە و تێڵەگێن و جرتاوە نیقابەی پرۆلیتاریایی بۆ گۆڕشینی ڕێژیمی سەرمایەداری هەڵدەنێ کە جارێ سەرمایە بە مەفهوومی سەردەم لە کوردستان پەیدانەبووە... لەمانە تێپەڕین بۆ ئایندەی دوای لەبەر یەك ترازانی گرێپووچەکانی مەتەڵی شیووعیەت: پرسیارەکەت وەها ڕادەگەیەنێ کە شیووعییەت و ئینترناشنالیزم لەمپەری هەرە گەورە و بنەڕەتیی پێش خوڕگەی تێهەڵکێش و ئاسوودەیی مرۆڤ بێت! بێگومان هەر بیروباوەڕێکی کەندی قووڵی جوداوازی و لێك دڕدۆنگ بوونی ئادەمیزاد، چ لە مەیدانی نێونەتەوەییدا و چ لە مەیدانی نێوان ڕیزەکانی یەك نەتەوەدا بێت، هەڵکەنێت. بە دوژمنی مرۆڤایەتی دەژمێردرێت با موژدەی ئاوی حەیاتیش لەگەڵدا بێت، کە دەزانین هەرگیز ئاوی زیندەگانی و گوژاڵی خەڵك تێکبەردان بەیەك شەلەگەدا ناڕۆن. ئێمە دەزانین تاکە هاندەری(خۆویستی)کە بزوێنێکی سروشتیی غەریزییە و لە سەرەتای پەیدابوونی ژیان و لە زۆر مەیدانی ئێستاکەی بووندا(بە تایبەت لە جیهانی غەیری مرۆڤدا) هەر کاریگەر و هەمەگیرە، ئا ئەو تاکە هاندەرە چ جۆرە فەلاکەتێك لە کۆمەڵایەتیدا دەڕسکێنێ، ئەوجا کە هاندەری عاتفی دڵبزوێن و دەرون و رووژێن کەوتە پاڵ خۆویستیەوە تۆ بڵێ چ بە مرۆی نیمچە ساوای نیمچە مەییوی نیمچە گێل و شەوکوێر بکات... بە بیرمە تا پەنجا ساڵێکیش پێش ئەمڕۆکە مرۆی بێگانە بە خۆی بە جلکی جودا و زمانی جودا و ئایینی جودایەوە وەك مێردەزمە دەهاتە بەرچاوی خەلقە چ نەدیتکەکەی ئەو سەردەمە: نەك ئەمە و بەس: بەری سۆران کە ڕانکی لینگ فەڕاحی لە قاچ و قولی پیاوی بەری بادینان دەدیت گوێی لێ قوتاغ دەبوو کە ئاژەڵ و گورگی دیتبێت... تا ئێستاکەش جوداوازیی لەهچە لەنێوانماندا مایەی جۆرەها دڵگەرمی و لێك سریواندنە تا ئەوەی خەریکە کوردستانە تەسك و تروسکەکەی سەر بە عیراق لەلایەن عاتیفەوە بە سێ کەرت بێت: بابان، سۆران، بادینان، ئا لەم ڕۆژانەدا کۆیی ناوی(عۆجە)ی بەسەردا دابڕاوە گۆیا لە قیادەی حیزبەکان کۆیی زۆرن، هەرچەند کۆیە بۆ خۆی خەریکە لە برسان دەمرێت و گەلێك لە ڕانیە و چوارقوڕنە داماوترە لەلایەن گوەزران و فراژی بوونەوە.. خەڵقەکەی بە دەوری دائیم خەریکی خۆڕزگارکردنە لەو بێدەرامەدییە بێهاوتایەی وەك هەوری ڕەش باڵی بەسەردا هێناوە..ز ئێستا بچیتە کۆیی دوو کەست چنگ ناکەوێ لەو بابەتەی جاران مەجلیسئارا بوون کەچی زۆر بەرهەڵستی دەکرا و دەکرێ لەوەی کە بکرێتە مەرکەزی موحافەزە... ئەم میسالە دەهێنمەوە کە موحتاجی شایەد و سوێند و تەڵاق نییە تا مەعلووم بێ لە ڕوانکەی بێگومانەوە کە لێکترازاندنی کۆمەڵایەتی بە نیازی تێك بەردانی خەڵقەکەی لە پەنا زڕە بەهانەی بەرژەوەندی گەورەوە تاوانێکە هیچ لێبووردنێك هەڵناگرێت وەك کە ڕێگر بە ەبهانەی برسییەتی خۆ لەتۆمەمتی ستەم و دڕەندیی دەرباز دەکات، کەچی هەر نەبێ ڕێگرەکە تفەنگێکی بە لاشانیدا هەڵواسیوە کەمێکیش نەبێ لە ڕاگوزەری کاروانی ڕووتکراو هەر هێندە شك دەبات کە لە پشتی کوچە کەرێکی بارکردووە. ئەم خاڵەی تێکبەردانی خەڵق هەویرێکە یەکجار ئاوخواز، بەوەندە لێی دەگرێم: شیووعیەت و ڕەگەزپەرستی و جوداوازیی ئایین و ئەوان جۆرە دەمار هەڵبڕەوەی پێوەندیی تەبایی‌ی نێوان خەڵق و خوا تێکڕایان تاوانی کوێرکردنەوەی شەقامی پێکەوە هەڵکردنی((تعایش))مرۆڤ بە ئەستۆو، دەگرن: ئێمە دەبێ هەمو ئەو بەهانانەی خەڵق بە شەڕ دەهێنن تاوانبار بکەین هەرچەند نیاز و داوایان لەسەر بنەمای ڕاست و دورستیشەوە هەڵستابێت. بەکارهێنانی ددانن و چەنبڵە لە ڕەوتی ئادەمیزاددا تەنها لە خاڵەتی خۆپارێزی و لەسرکردنەوەی ستەمدیدە ڕەوایە. دەمەوێ بڵێم ڕەوینەوەی مەترسیی خەڵق گێلکردن و تێکبەردان بە هەرەسی سۆڤێتنسان نایەتە دی. مرۆ تەنها چاوێکی نیمچە خەواڵووشی بە دنیادا بگێڕێت و هەر لە ناکۆکیی نێو خێزان و گەڕەك و وڵات و تیپی یاری کردن و کێبڕکێ لەسەر هەزاران هەزار هۆی گرنگ و خوێریلە و بەربەرکانێی دەوڵەتان چ لە یەك جۆرە ڕێژیمی سیاسیدا بن چ جودا... هەتا دەگەیتە کاری مێگالۆمانیا و گرێی ناکامی سەرۆکان و هەتا... و تەها ئەوپەڕی‌ی مەودای چاو تێبڕنەکردوو لە جوداوازیی تاك و کۆمەڵ لە هەموو ڕوویەکەوە.ز ئا ئەو دەریا لەسەر دەریای لێك هەڵگەڕانەوە و پێکدادان و لێك مۆڕبوونەوە و نازانم چی و چی بگرێتە بەر نیگای وردخوێن و بیخەیتە دەستە تەرازوی هۆشێکی ڕوون و دڵێکی ئارام لێت سوور دەبێ کە(ئاسوودەیی)ی مرۆڤ لە دەست دەردەکانی خۆکرد و خۆئاوسکەر بە دەردی نوێتر تەمایەکە چەندێکی پیرۆز و بە شەرەف

و ڕەوا و شایانی مرۆڤ و شانازی پێوەکردنە هێندە و لەوەش زیاتر دوورە دەست و نەفەسبڕ پشتشکێن و مرۆخەسێن و مێینەزۆککەوە... لە نوسیندا گوتوومە عالەمی پێشکەوتوو لەوانەیە داهێنرێت لە بن قورساییی تەبەق لەسەر تەبەقی کوێراییی گومڕایی و بە هەڵەداچوویی و خوێڕیەتیی ئەو جیهانەی سێیەمی کە من زۆرجاران دەڵێم عالەمی سێیەمی پاش ژمارە سەد چونکە بە ڕاستی زۆربەی دەوری ٤ ملیار بە شەڕی ئەو جیهانە حەیفە پێی بگوترێ مۆڤ..ز لە کۆتاییی ((من همون الحیاة))ئەم چەند دێڕە دەخوێنیتەوە کە لە دیدی خۆمەوە سەیری عالەمی بیستەم و پەنجایەمی پێ دەکەم: انك مهما حاولت ان تنظر الى عالمنا من وراء زجاج قوس القزح فلن يطالعك الا منظر اسود بعضه بالمحروق و اجمر بعضه بالمسفوك. فاذا تسنى لقوة وهمك ان تجد بصيصا يفئ بالتبشير فانى لم أجد شيئا من ثمار حسن التدبير وحكم المنطق وداعية المصلحة و راحمة المعدلة وانما وجدت المصير موكولا الى ذاته نحو المستقبل بلا ضابظ أو دليل فنحن فاقدون ماتملكه الارض في انشدادها بقوة الجذب الى الدوران المنظم حول الشمس قندور في الفراغ أو نمرق كالسهم المنطلق الى غي هدف. دنيانا جرح مفتوح ينز. لاظبيب ولا علاج وانما قدره الجسم الخى على الشافء من طبيعة تكونية، واحتمال الشفاء والفناء مقسوم بينهما بنسبة خمسين الى خمسين..))

خەتم لە ژێر ئەو چوار وشەیە کێشا(لە کتێبەکەدا خەت نەکێشراوە) بەو نیازە کە سەرنج ڕاکێشم بۆ ڕاگەیاندنی نەبوونی ئومێد بەو چوار کاریگەرە لە زەمینەی ڕزگاربوونی جیهانە ناپیرۆزەکەمان، لەوەڕا ئیحتمالێکم بۆ وڵاتە پێشکەوتووەکان لە سەدەی داهاتوودا لەگەڵ سەرەوژووچونیان عالەمی بیستەمیش لە قۆرتەکەی دەرهێنن. دەزانم لە وانەیە تاکێك نەبێ لەو ملیۆنانەی خەریکی یەکدی بڕینەوەن بیر لەو لایەنە بکاتەوە بەڵکە، بە پێچەوانەوە، کە ئەو تاکە خۆی سوارچاکی دڕی و شڕی و بکوژە بسوتێنە بێت بێگومان گاڵتەی بەو قسەیە دێت و بە زۆریش ئەو تەرزە جانەوەرانە شارستانەتیی شوێنی وەك دانمارك بە پاشکەوتویی حەیاچوون دادەنێن. پاش تەقینەوەی بوومەلەرزە وێرانکەرەکەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨، ئەو خوێنگەرمانەی ڕێیان دەکەوتە ئەوروپا کە پێشتر خەونیشیان پێوە نەدەدیت، بە لایانەوە خەڵقی ئەوروپا لە سیاسەت زۆر پیادەن و چ نازانن، تۆمەز کاکی دڕندەی عیراقی وای دەزانی عەقڵ و غیرەت و بەرژەوەند لە هوتاف و دروشم و نەڕاندن و کە لەش ڕاکێشاندا هەیە... هەر نەیسە! ڕمانی لووتکەی سۆڤیەت و ڕەها بوونی ئەوروپا شەرقی بووە هۆی وەستانی جەنگی فێنگ، ڕەنگە لە ماوەیەکی موناسیبدا ئەمەریکاش لە کەری خۆی دابەزێت کە واقیع لێی قبووڵ ناکا، خۆیشی هێندە گێل نییە لە خۆی بسەلمێنێ هەڕشە لەو دەوڵەتە بچوکانە بکات بە

چەکی ئاتۆم کە جاران سەلامەتیی خۆیانیان لە لەنگەربەستنی دوو دەستە تەرازووی دوو لووتکەییدا دەدیت.. هەوای یەکەمینایەتی و تاك پاڵەوانەتیی سەر شانۆی جیهان بەینێك سەروسوورکێی پێ دەکات(واتە بە ئەمەریکا) بەڵام ئەگەر دنیا تەقلەی نوێ لێ نەدا و پاڵەوانێکی تازە پەیدا نەکا ئەمەریکا چاری ناچارە لە ڕێی ڕازیکردنەوە(بە هەر جۆرە هۆیەکی سیلمی بێت) لەگەڵ دنیادا مامڵەت بکات.. لەو ناوەشدا یەکبوونی ئەوروپا هێزێکی گەورەی بەرەو (تفاهم) نەك(بە حەقی کۆتەك)پێکدەهێنێت. کەوا ڕەنگە لە دواڕۆژدا پارسەنگی جۆرەها ڕیزبەزاندنی فێڵبازانە یان هەڕەشەکارانە بداتەوە. بەڵام جارێ زووە بۆ بڕیاردان لەسەر چۆنیەتی لەنگەربەستن و چەسپاندنی باری سیاسی- کۆمەڵایەتی لە ڕووسیا و ئەو دەوڵەتانەی خۆی پێوەدەبەستنەوە... بە داخەوە گۆرباچۆڤ پتر لە لزوومی دڵدانەوەی مارکسیزم و لینینزم و شیووعیی(منصوف)خۆگیریی کرد لە هەڵێنانی هەنگاوی پێویست بۆ پتەوکردنی ئەو بنەمایانەی دەبێ ببنە جێگیری مارکسیزم چ لە فکر وچ لە کردەوەدا. من دوو جوزئم لە نەقد و تەحلیلی پێرۆسترۆیکای گۆرباچۆف نووسی دەوری ٣٠٠ و کسوور لاپەڕەیان خایاند تا گەیشتمە لاپەڕە ٦٠ی کتێبەکە. لەوە بەولاوە جڵەوی ڕووداوان لە دەست گۆرباچۆڤ دەرچوو ئیتر نەقد و تەحلیل شتێکی بەسەرچوو بێسوو ما.

دواڕۆژی بە چ باردا دەکەوێت مەحکووم نییە تەنها بەو گۆڕانگارییەی باسی دەکەیت، ئەو ڕووداوە لە کولانەی چارەنووسی ئادەمیزادەوە سەیری بکرێت، ئەگەر نسکۆی نەیەتە پێش، دوو ئەنجامی خۆشکەڵەی دەبێت: یەکێان ئەوەیە ترسی شەڕی ئاتۆم زۆر کز دەبێتەوە. دووەمیان ئەوەیە لەمپەری تیژڕۆیی شیوعیان لە نوختەنیگای شەڕی چینایەتی و گومان کردن لە هەرچی شیووعی نییە گەلێك تەخت و بێپۆز دەبێت.. ئا ئەم دوو کاریگەرە تەئسیری ئایەتی(ئایەتی: ئەرێتی)ی باشیان دەبێت لە گەلێك مەیدانی ١- سیاسی ٢-ئاسوودەیی ٣-ئابووری، بە کەمبوونەوەی مەسرەفی چەك و جەنگ و بە کرانەوەی مەیدانی ئاڵوویر و بەرهەمهێنان و ماڵداری لە ئاکامی بێتەئسیریی کۆنە توهمەی شیووعیان کە لەو چالاکییانەی نا شیوعییانیان دەگرت و بەشێکی زل و زەبەلاحی بێگوناحی تێدا گوناهباران دەکرا ولایەنی تێکۆشەرانی دەوروبەری(ناوەڕاست) و بێتەرەفان پێ زراوڕژاو دەبوون و ئایەتوڵکورسییان لە خۆو ماڵ و منداڵیان دەخوێند... هەڵبەت مرۆی چەپڕۆ وەیا توندڕۆ(لە هەر بابەتێك بێت)وەك هەموو دەرد و وەبایەك وێرانکەر و تێکدەر و وەخرێنە: هەر بیروباوەڕ و کردار و گفتار و ئامانژێکی توندی و هەڕەشەی لەگەڵدا بێت دەبێ ئافەرۆز و

حەیاتکاو بکرێت، ئەم فەرمانەش لە خۆوە جێبەجێ نابێت، دەبێ هەموو ئەو هۆشکراویەوانەی دۆستی بێ تەئویلی کەرامەت و چارەنووسی مرۆڤن، چالاکانە(بەڵکە لە زۆر باردا خۆ لە بیربردووانە)ڕێ لە ڕێگر ویژدان و خواستی خەڵق کوێر بکەنەوە. هەروەك خوێنگەرمەکان بە هەزاران و ملیۆنان لە پێناو لغاوکردنی خوێن نەکوڵاوەکانی دەرەوەی تیژڕۆیی و لە بەربەرەکانیی دژی ڕێیم و(استعمار)گیانیان لەسەر لەپی دەست دادەنا و خێزانەکانی خۆیانیشیان دەخستە خەتەری حەبس بوون و ئیفلاس، دەبێ کەسانی پەرۆشخۆر بۆ ڕیبازی دیموکراسی و ئاشتی و دادیش تا ڕادەیەك لە سستەمی کۆنینەیان و ترسی تۆمەتی ناشیووعی بونیان دەرباز بن و لەسەر کەرامەتی خۆیان و ئادەمیزاد بەتێکڕایی دەنگدلێر و چاوقایم و(لە پێویستدا) جەربەزە بن: لە نموونەدا دەڵێم سالچی ١٩٥٣ مامۆستایەکی دەرسی ئینگلیزی لە سانەوی کۆیی، ئوسترالیایی بوو ناویشی(ستیپلتن)بوو، بۆی گێڕامەوە کە شیووعییەکان لە ئوستralیا فێربوون هەر جارەی کۆبوونەوەیەکی عادەتیی نا شیووعی گیرابایە چەند کەسێکی بێشەرمیان دەترنجاندە کۆبوونەوەکە و بە هەر نامەیەك بێت دەیانشێواند.. گوتی ئێمەش وەك ئەوانمان کرد، چەندێکی کۆمەڵ بوونایە لێمان تێکدەدان هەتا ئیفلاسمان پێ کردن..ز ئێستا لە جیاتی شیووعی جۆرەها دەستودایەلاەی خۆسەپێن و لە کەس نەسەلمێن گەشە دەکات و دەتەنێتەوە، ئەگەر لایەنی بەرەو ڕووناکایی و چوونەپێش جڵەوی سیاسەت و ڕشتەی هێمنایی و مافی مرۆڤایەتی و ئەو جۆرە ماکە کاریگەرانەی(کە بە داخەوە جارێ ساوان)بە شێوەیەکی تا ڕادەیەك. هەست پێ کراو لە دەستدا نەیایە، بێگومان منیش و مەگەزی زەلکاوان فیلیان دەخستە سەر پشت(چاوپۆشی دەکەم لەو حیزەفیعلانەی بۆ تەئمینی بەرژەوەندی بەرتەسکی دەوڵەتی بە دەسەڵات و هی کەمدەسەڵاتی خاوەن تەکنیك نرخە بە شەرەفەکان پێشێك دەکەن، ئەمیشیان چیرۆکێکی بەسفتوسۆیە کات و کاغەزی پێ پڕناکەمەوە).

باری((چین)) بە خۆی و ١٢٠٠ ملیۆن نفووس و ئینجیلە پەرپووتەکەیەوە مەسەلیەکی سەربەخۆیە بە بەریەوە هەیە لەنگەربەزێن بێت، زۆریش پێویستی بە گلاسنۆست و پێرسترۆیکایەکی تایبەت بە خۆی هەیە... تا ڕادەیەك هیندی غاندی و نەهرۆ بە قورسایی ٧٠٠-٨٠٠ ملیۆن نفووسیەوە و دیمۆکراسییەکی میلەو ڕەگداکوتاوی مێژوویی‌یەوە لەو هەرێمەی ڕۆژهەڵاتی دووردا کە ژاپۆنیش هاودەنگی دەبێت لە ململانێ دا پارسەنگ دانەوەی مامڵەتی نێوان هێمن و دەمارگشتیدا دەستە تەرازوی بەرانبەر چین ڕاست ڕادەگرێت(ئەگەرچی لە ڤیش بێت)... ڕەنگە بشێ بڵێین نەمانی ترسی هەڕەشەی سۆڤیەت لە کپکردنی دەروونی(ئەوروپا)بە گشتی، ڕەهاکردنی دەنگێکی دلێری دیموکراسی و مافی مرۆڤی پێوە دەبێت کە ئەمە بە لای چاکەی ئێستاکە و دواڕۆژی هەموو ئادەمیزادە و بەرهەمیشی لە کڕی خۆیدا دەبێت ئەگەر ئاپۆڕەی ملیارەها خەڵقی جیهانی تاریکمان لە سڕی و وڕێنە و نیگائاڵۆزی ئەفسانەی بەنگکێشیی مەیلەو بتەکێنەوە، چونکە جەندێکی پاسەوانی قەبرستان(کە ئەوروپا بێ)چالاکی بکات لە پاراستنی کێلە قەبران هەر ناتوانێ مردووان بە خەبەر بێنێ.

بە نیسبەت خۆمانەوە گوتوومە و دەڵێمەوە ئەگەر کورد نەبڕێنێتەوە بە براکوژی و بە چەپڕۆیی و داوای لە توانا بەدەر، سیاسەتی عالەمیش گۆڕانکارییەك وەك سەرەوبن بوونی تێدا ڕوونەدات دواڕۆژی گەلێك ڕوونتر دەبێ لە ڕابووردوی و چارەنوسەکەی پتر دەکەوێتە ناو جغزی هیوا و نەمایەوە، بەڵام ناشێ سنوور دانێین لە خەیاڵەوە بۆ ئەم شانۆگەرییە چەندین لایەنە، ئایا پانایی‌ی چەندە و چەندیش کات دەخایێنی هەتا قاڵبی هەرە دوایی وەردەگرێ... لێرەدا کۆتایی بە وەڵامی پرسیارەکە دەهێنم هەرچەند گەلێك لایەن و چەندوچۆنی و کەی کوێی تێدایە ڕوون بکرێتەوە بەڵام لێ بە کۆتایی گەیشتنی لە توانا بە دەرە.

٢-وەك پاشکۆیەکی پرسیاری پێشوو دەمانەوە بپرسین کەوا تەواوی دیاردە دڕندە و ترسناکەکان کە کۆتایی ژیان بە دەردەخەن و ئێستا لە ئەوروپاش بەشێکی زۆری زانا و نووسەرەکان نووسین لەسەر نوغرۆبوونی دنیا بڵاودەکەنەوە، قسەی ئێوە لەسەر ئەم حاڵە چییە؟

ئەوەندەی ڕێمان هەبێ قسە لە وێران بوون و نەبوونی دنیاکەمان بکەین بێ ئەوەی ببینە کتێبگرەوە و ڕەمڵلێدەر ئەوەیە کە چەکی ئاتۆمی، یاخود بابڵێین بەکارهێنانی ئەو هێزەی ئاتۆم بە بەریەوە هەیە لە دواڕۆژدا جیهان بکاتە بە هەشت، بە بەریشیەوە هەیە داری لەسەر بەردی نەهێڵێ: هەر ڕۆژەك ئەو چەکە کەوتە دەستی دەوڵەتی بێباك لە ئاست ئاکامی بەرەڵڵابوونی یاریکردن بە مەرگ و ژین چ دوور نابینم بەکاری بهێنێ وەیا بە مافیا وچەتەی دنیای بفرۆشێت، ئەگەر مرۆ کەمتەرخەمی بکات لە ئاست مامڵەت لەگەڵ ئەو چەکە، یان ئەو هێزە، جەندەمییە وەك ئەوەیە بڕیاری خنکاندنی خۆی ئیمزا بکات... لەگەڵ هەموو جۆرە ئیحتمالێکی کە چاوەڕوان دەکرێت من بۆ ئەوە دەچم لە ئاکامدا لایەنی بەرژەوەندی مانەوەی نەوعی مرۆ بەسەر لایەنی هەڵەشەییی خۆبڕاندنەوەدا زاڵ بێت.

٣-ئەم دروشمە کە بانگەشە دەکات و دەڵێ: "هەموو بیروڕا و فەلسەفە و ڕەفتارێك دەدەینە دواوە کە لە بڵندی و کەرامەتی مرۆڤ

کەم بکاتەوە و مرۆڤ بخاتە خانەی سەر بە هەرچییەك! چۆن هەڵدەسەنگێنن؟!

لەبارەی هەڵسەنگاندنی دروشمی کەرامەتپارێزیی مرۆڤ، ئا ئەم پرسیارە لە زۆر شوێنی نووسینم وەڵامی دراوەتەوە و چەندین جار گوتوومە شەرەفی مرۆڤ بەندە و دروشمێك و ئایدیۆلۆجییەك مرۆڤ لە پلەی یەکەمینایەتیی بوونەوەری جیهان دابەزیچنێت تاوانبار و گومڕا و بێشەرەفە کە ئیتر پێویستی نامێنێ پیاو بکوژێت یان ماڵی دنیا بدزێت یا بوختان هەڵبەستێت یان جاسووسی بکات هەتا ڕیسوا و بێنرخ بێت، چونکە دا لەنگاندنی پایەی مرۆڤ بۆ هەر مەبەستێك بێت لێی دەوەشێتەوە ڕێگە دەربکات بۆ هەرچی قەباحەتی ئابڕووتکێن هەیە: یەکێك مرۆڤ لە نوختەنیگای ئایینەوە بە گوناحبار دابنێت، هەر بە نامەی پەند و ئاگربڕی کردن لە تەنینەوەی گوناحەکانی چی سووکایەتی هەیە وە پاڵی دەدات وەك کە دێت و پێی دەڵێت: ئەوی ئەوەی دوو جاران بە ڕێگەی میزدا هاتوویە خوار... یاخود لە پەنا بەرەوژوور بردنی پایەی((هۆی بەرهەمهێنانەوە)) بیکاتە قوڕەچەورە بە دەست ڕابەری سیاسییەوە... من کە دێم باسی مرۆڤ دەکەم بە هەموو عەیب و عاریەوە لە پێشەوە سەلماندوومە و لە خۆم کردووە بە ئایین کە مرۆڤ هەرچەند لە پلەی زێدە کز و بەرەوژێری تێگەیشتن و و بەخۆنازین و ڕەفزی بەندەییدا بێت دیسانەوە هەر خۆی تاکە کاریگەری مێژوو و کۆمەڵایەتییە و بێ ئیو ڕووت و ڕەجاڵەی کە جارێکیان دەبێتە میری سەربڕو جارێکیشیان پێڵاوی ئاغا و شێخ ڕابەری سیاسی ماچ دەکات و لە لایەکی دیکەوەش چرای زانست و داد و شەرافەت هەڵدەگرێت، بێ ئەو مەخلووقە هەرچی سروشت هەیە گیانی شانازی و نرخی بەرز و ئیبداع دۆزینەوە و داهێنان دەدۆڕێنێت و دەبێتە قەپێلکی حەتاڵ و بە تاڵ، بێئاگا و بێنیاز... مرۆ ئیعجازی هەرە هەرە گەورەی چەرخوفەلەکی نهۆمی کۆنینە و فەزای بێسنوور و بڕانەوەی سەردەمی زانست و تەکنیکە(هەتا دەمی ئەم نووسینە قسەکەم بە ڕاستی موتڵەق دەزانم، ئەوجا ئەگەر لە دواڕۆژدا ئیعجازی گەورەتر پەیدا بوو، واتە دۆزرایەوە، ئەوسا قسەکە دەگۆڕێت بە هێنانە خواری پلەی مرۆڤ لە ژمارە یەکەوە بۆ ژمارە دوو).

٤-لاتان وایە دیالەکتیکێکی نوێ بۆ بیناکردنی ژیانێکی باشتر بۆ مرۆڤ شیاوی تێهێنانەوە و ڕسکان بێت؟!

لە بارەی هەڵنانی دایەلێکتیکێکی نوێ بۆ بیناکردنی ژیانێکی باشتر! من واقیع دەکەم بە باوك و دایکی فەلسەفە و بەرنامەی ئاسوودەیی و کەرامەتی مرۆڤایەتی، نەك لە لاوە بیروباوەڕێکی هۆشکرد یان خەیاڵکرد یان ئومێدکرد بەسەر مۆڤدا دەسەپێنم. من بە قاڵێکی میراتی و شارەزای بازاڕ بەسەر فەیلەسووفێکی نرخی شووتی و باینجان لە موعادەلاتی هۆش و فەلسەفانەوە هەڵێنجێت، ڕادەشکێنم. دەبێ بزانین دایەلێکتیك و ئایدیۆلۆجیا و هەرچی فکرێکی شەختەکردوو هەیە(واتە: قاڵبەستوو)بە زۆری هەرەزۆر دوو فەلاکەتی گەورەیان بە دەمەوەیە: یەکێان خۆسەپاندن تا ڕادەی خۆکردن بە دین، دووەمیان کوێرکردنەوەی ڕێی هۆشی ڕەها و تاقیکردنەوەی مەیدانی و خیاری ویستن و نەویستن. عەرەبی عیراقی لە کۆنەوە ئەم پەندەیان داناوە، زۆریش تێیدا سەرکەوتوون: ترید أرنب أخذ أرنب، ترید غزال أخذ أرنب، ئا ئەمە دەستووری هەموو بیروباوەڕێکی هەڵنراوی بە ژمارە هێندە و تەئریخی هێندە و فەرموودەی فیسار و نووسینی فڵانە کە دەخرێنە جێگەی حوکمی خوڕگەی ژیان و چالاکیی عادەتیی پەلەی ژیان لە چارچێوەی((پێکەوەهەڵکردن و بەرژەوەندی سەلمێنراوی ڕۆژانەدا)). دەورانی ئیرادەی مرۆڤ بە فەلسەفەی ((پیرۆز)) دەکەوێتە ئەودیو سنووری ڕەهاکردنی ئیرادەی مرۆڤ، واتە دەبێتە پەرژینی مەنعکردن لە لێ تێپەڕینی. کە هات مرۆڤ لە ڕەها بوونیدا سنووری بەزاند، بە ئاسانی هەر لەبەر تیشکی یاسای عادەتیدا، و بە بەندیکردنی یەك حەفتوو دەکشێتەوە لەو پێ لێ هەڵبڕینەی(مەرج نییە بەندیکردن بێت، دەشێ ڕۆژانە بڕین بێت)(ئەو دوو دێڕەی خەتم لە ژێریانەوە کێشاوە باوەڕی خۆمە نەك درێەی قسەی پێش خۆیەتی کە من پێی ڕازی نیم). بەڵام کە ئایدیۆلۆجیا و فەلسەفە و بەرنامەی(مقدس) لە مپەرێکی ترنجاندە هەیکەلی نزام و پێڕەوی بەرێوەچوون و دابینکردنی حەزی مەشرووع ئەوسا شەڕێکی خاچپەرستان نەبێ ئەو لەمپەڕە لا نادات. تۆ ئەگەر پاڵەوان و قارەمانیت وەرە یاسای ((مچمچە))ی سەر بە دەستنوێژ بسڕەوە. ئەشەدوبیللا عەرشی پەروەردگارت لێ بە ئاگا دەهێنن... یان ڕەخنەیەك لە مارکس بگرە یان ئەگەر تامەزرۆی ڕەقسی فڵان و نەخشی فستان و بالۆرەی نازانم کێیت وەرە خۆگیری بکە لە ڕەخنە و توانجێکی تێیان بگیرێت.. ژەنگە بریقەدارەکەی کە لە دروشمی پیرۆز دەنیشێت((نعوژ باللە)کێ دەوێرێ لێی بکڕێنێت. لە باری ئێستاکەدا چی پێی دەڵێن جیهانی پاشکەوتوو( بە لێ دەرهاویشتنی چەند دەوڵەتێك نەبێ) ئەوەندە ئایدیۆلۆجیا و فەلسەفەی بەسە(لێشی زیادە)حکومەتێکی مام ناوەنجیی نەکوژێ نەدزی هەبێت و بە قەدەر حاڵ هەوڵی پەیداکردنی بژێوی بۆ بدات: بێگومان هەر حکومەتێك لەو حکوومەتانە کەوتە سەر باری فەلسەفە لێدان و پێداهەڵگوتن بە بەژن و باڵای ڕۆڵە هەڵمەتبەر و قارەمان و نیمچە پێغەمبەرەکانی، سەرلەبەری ئەو قەوانانە دەکاتە کوتەیە سەربڕینی پشتشکێنی... ئەگەر بلوێ(کە زۆر زەحمەتە بلوێ) بێن و تامێکی دیموکراسی و وردە بەهاراتێکی مافی مرۆڤ بکەوێتە

مجێزی حاکمەکانی عالەمی سەدوبیستوپێنجەم تا ئەوەی کەشەقیان وەشاند کابرای شەقخواردوو قۆڕ نەبێت. ئا ئەم ڕەحمەتە لە گۆڕی ڕەحمەتییانیش زیادە. لە لاپەڕە ١٥٦ی ((من هموم الحياه))ئەمەم لە بارەی تێکۆشەرانی عالەمی سێیەمەوە گوتووە: انهم قد يكونون مدافعين عن أنبل القضايا ولكن بروم الذئب الطامع فى القطيع وقد يكونون أبسل الناس في الجود بالروح ولكن في تربص قاطع الطريق بالقافلة.. ذلك أن أحسنهم اخلاقا واوطئهم اكفافا واقربهم الى المرحمة تناهوا من خلال ايمانهم المطلق بالذات الى الادانة المطلقة لذوات الاخرين فليس في قاموسهم حيز للحرية والاختيار الا ان تكون حرية تأليههماختيار تقديسهم والتسليم بما يؤمنون.. دەستوور و یاسادانان بۆ سروشت تاڕادەیەك بۆ، زیندەوەرە(غەیری بەشەر)ە.

٥-ئایا مرۆڤ وەك نهێنییەکی قووڵ بە ئاستێکی درشت و بەرچاو گەیشتووە یاخود هەر هێشتا گیانەوەرە نەناسراوەکەیە؟!

لە لاپەڕە ٤٤ی کتێبی(من هموم الحياه)کە یەکەم لاپەڕەی دووەم بەشی کتێبەکەیە لە ژێر سەرناوی((نفچ غبره عن جبين الشمس)) ئەمەم نووسیوە".. فليس بالمعرفة عسر هضم أو تصلب شريان كى تعيى بالمحسوس أو بالمفهوم أو بالمستخلص أو بالمشتبكة او بالمستشعر او بالمستسر الذى يطلب الف سنة من الفكرلا والنظر واتلجريب..)) دواتر لة ثةرِة ٤٦ دا دةلَيَم((... بل انها ستبلغ مديات من العمق والتسارع والاتساع تتجاوز بها مفهومنا للزمن نفسة: انها ستخلف وراءها سرعة الضوء فتسخر الزمن مطية قد تبطىء وتبطىء حتى التلاشى وتسرع وتسرع حتى تخلف نفسها ظاهريا. والفكر في يومنا هذا عاجز كل العجز عن تخمين امكانات المعرفة في الفتوح والكشوف وفى النقض والتركيب وفي الاستيلاء والتعقيم وفي التمكين والتعجيز وفى الحذف والاضافة وما الى هذه المعانى الشاغلة لكل المسافة بين اللاشئ والانهاية...)) دەبینیت لەم ڕایەی ساڵی ١٩٨٨ بڵاوم کردۆتەوە لە دەمێکیشەوە پێی دڵنیام من لە مرۆڤ ڕادەبینم بگاتە زانینی هەرچی پێی دەگوترێ عالەمی ماددی تا کاڕکاڕەی هەرە شرایەوەی ڕاستییە نهێنییەکانی(دەبێ لێرەدا بڵێم ئەم دەسەڵاتەی گەیشتن بە کونهی ڕاستییان هەر لە سنووری ماددە وهێزەکانی فیزیاو نهێنییەکانی کاریگەرە و ڕێی نییە بگاتە کونهی(خوا)چونکە سروشتی خوا و ماددە لە هەمو ڕوویەکەوە لیˇ:تر جودان. ئەمە دەڵێم نەکا فکری خواپەرست وا بزانی من خوام سڕیوەتە یاخود بوونەوەرێکی ماددی دادەنێم.. حیکایەتەکش زۆری بە دەمەوەیە، دوای ناکەوم). وەك لێشتەوە دیارە من لەو باوەڕەدام جاری زووە بۆ بڕیاردان لەسەر چۆنایەتی و چەندایەتی و کەنگینایەتیی پەیدابوونی عالەمی هەستپێکراو.. لێرەدا مەودام نییە نوختەی جوداوازیی بیروڕای تایبەت بە خۆم لەگەڵ بیروڕایەکی(وەك دوایین مۆدێلی تەفسیری و وجوود)زاناکانی فەلەك و فیزیا لە بارەی هەوەڵ پەیدابوونی((ماددە... و جوود))ەوە شەرح بدەم چونکە یەکجار درێژخایینە و لە هەندێ حاڵوباریدا زمانگێڕان وە زەحمەت دەکەوێ... بە هەمە حاڵ، کەیشتن بە کونهی(ئادەمیزادەیەتی) بەندە بە گەیشتن بە کونهی عالەمی لە ئادەمیزاد بەرینتر کە هەموو دنیایە.. بەڵام دەشێ زمان بکێڕین لە زۆر لایەنی: (١) سەر بە خودی مرۆڤ، (٢)سەر بە مرۆڤێکی کە دەزانین چ کۆمەڵایەتییەکی گرێیاوی و پڕ تەنگوچەڵەمەی خۆکردی ڕەخساندووە،(٣)سەر بە پێوەندی نێوان مرۆڤ و غەیری مرۆڤ چ گیانلەر چ بێگیان... من کە دەڵێم زانینی کونهمی مرۆڤ بەندەی بە زانینی کونهی عالەم لەم ڕووەوەیە کە وا گەلێك باری نایەتیی(نەریتی)کە لە سەرجەمی چالاکییەکانیدا هێندە چڵکن و گلاو و بێشەرەفە سەرچاوەیەکی گلاوتری دەوێ لەو هێندە گلاوییەی کە کەم بڕشتیی هۆشی و کاڵۆکرچیی نەفسی لێی ڕەچاو دەکرێت وەك کە منداڵێکی ساوا هێندەی مامۆستایەکی سانەوی شتان بزانێت دەبێ زەکایەکی لە حەد بە دەری هەبێت..ز لە لایەنی(ئایەتی)شەوە هەر ئەو مرۆڤەی دەیناسین دەگاتە پلەی ئەوتۆ لە تێهەڵکشێن بە تایبەتی لە مەیدانی دوورەهەست و پێشبینی و غەیبزانی و ...و... هتد کە هەمووی خۆڕسك و بێ مامۆستایە، وەها لە پێزانینمان دەکات کە بڵێن کاریگەرێکی دەرەوەی زاتی مرۆڤ سەرچاوەی ئەو جۆرە دیاردانەیە. لە تەجرەبەی سەرنجڕاگرتنی خۆمدا، هەر لەو مەیدانەی وا قسەی لێوە دەکەم، شتی ئەوتۆییم لێ بۆتە مەتەڵ کە بەوەندە شارەزاییەی لە مرۆڤمان هەیە مەتەڵەکە هەڵنایەت، ئیتر بۆ تەعلیلی ئەوتۆ چووم کە لە سەرچاوەی نهێنییە نەدۆزراوەکانی سروشتەوە هەڵمهێنجاون، دواتر لەك تێبی عیلیمی زۆر بەرز نموونەی زل زلم خوێندۆتەوە کە سروشت دەخلی هەبووە لە چۆنیەتییان هەرچەند نمونەکان لە حاڵ و باری زیندەوەرەوە بە جۆرێکی دوور لە تەئسیری دەورەبری ماددی کەوتوونەتەوە.. جارێ توژاڵێکی سەرووی ڕووی شتان خۆی بۆ بەرچاوی وانست وتەکنیك یەکالا کردووە هەرچەند ئەو توژاڵەش ئەوەندە زانیاریی سەیروسمەری بە خەڵات پێ بەخشیوین نەیەتە حیسابەوە..ز لەم درێژەیەی قسەی مەیلەو سەراو تەنکەوە دەگەمە ئەو ئاکامەی کە لە کولانەی بەرژەوەندی مرۆڤ و چارەنووسیەوە گەیشتنی ئادەمیزاد بە حاڵەتێکی لە کەرامەتی بوەشێتەوە و تێیدا بە جۆرێکی مەعقوول حەسایەوە بێت، تەمایەکە لە پلەی ئێستاکەیدا بە موستەحیل دادەنرێت چونکە نموونەی کۆمەڵگەی تیرۆو تەسەل وئ حەسایەوە ئێستاکە هەیە و دەشێ ژمارەی لە زیادبووندا بێت، واتە مەرج نییە حاڵ و بارێکی مام ناوەنجی و مەقبووڵ بۆ گەلە دواکەوتووەکان مومکین نەبێ هەتا کونهی(وجوود)نەزانرێ: ئەوەی بەندە بە زاینی ئەو کونهەوە زانینی کونهی مرۆڤایەتییە هەرچەند دەزانم کە

کەودەنی و گێلایەتی گیشتە پلەیەکی زۆر پەست و بەرەژێر وەها دەکات گەیشتن بە خۆشی و کەرامەت خۆ لە موستەحیل دەخشێنێت.. بی ئەوەی خۆ بدەمە شەرح زۆر بە خێرایی، ئەوەندەش دەڵێم، دوور نابینم مرۆڤ چەند تیرەی بنەڕتیی هەبێت نەك هەمووی لە یەك تیرەو باپیرێك کەوتبێتەوە: تۆ بڵێی هەروا لە خۆڕایی و بێ سەبەب دو جینسی زەرد وسپی بە درێژاییی زەمان بە یەکەوە جیران و تێکەڵ بن کەچی جوداوازیی نێوانیان هەر بەردەوام بێت مەگەر لە ڕێی بە یەکتر گەیشتنی مێ و نێری دوو جنسەکە کە ئەوسا وەچەیان دووڕەگە دەبێت؟ دەمێکە لەوە وورد دەبمەوە بە خامۆشی..

٦–ئاشبەتاڵی سیستەمی سۆسیالیزم چ تامێکی ئەرێتی و نەرێتیی بۆ مەسەلەی کورد قوت کردۆتەوە؟!

لە بارەی ناکامی چاك و بەدی ڕمانی سۆڤێتستان(تۆ ئاشبەتاڵی سیستەمی سۆشیالیزم بەکار دێنێت) لە مەسەلەی کورد، لە دوو خاڵ و نیولادا وەڵام دەدرێتەوە. خاڵی یەکەم ئەوەیە سۆشیالیزم قەت بەلای چاکەی کورددا نەچووە و فلسێکی لێ خەرج نەکردووە. ستالین مەهابادی فرۆشت بە ڕێککەوتن لە سەری نەوتی شیمالی ئێران لەگەڵ قوام السلطنة... پێشتر لە سەرەتای شۆڕشی ئۆکتۆبەر و لە سەردەمی لینینەوە ڕووسیا لایەنگیری موستەفا کەمال بوو، جگە لەوەی کە برا شیووعیەکان هەمیشە کات ڕایان نوواندوە کە(کوردایەتی) دەبێ لە جغزی ئینتەرناشناڵدا بخەبتێ، نەك چینی زەحمەتکێش لەو وڵاتانەی کوردی تێدا دەژین دوو کەرت بێت و بە داخەوەچەندێکی توانیبێتیان تۆمەتی ڕەگەزپەرستی و (انفصالیە))یان وەپاڵ داوە. نوختەی دووەم ئەوەیە کە نەمانی هەڕشەی ڕووسیای شیووعی لەو وڵاتانەی کە کوردی تێدا دەژیت، تا ڕادەیەك لە حەماسەتی هێزەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا کەم دەکاتەوە بۆ پشتگیری کردن لە کیانی ئەو وڵاتانەی دژی جموجووڵی کوردایەتی، نوختەی سێیەم ئەوەیە کە لە دەستەتەرازووی بەرانبەر ئەو دوو خاڵە ئیجابییەدا خاڵێکی سەلبیی کز و کەمبڕشت خۆ ڕەپێش دەکات کە کورد وەك میللەتێکی ژێردەست، دۆستێکی خەیاڵکردی دۆڕاند بە تێکچوونی بەرەیێك کە لە سەر ڕووی کاغەز یەکسانیی مافی میللەتانی تۆمار کردووە.. خوام حەقە، لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا، شایەدی ئەو دیاردەیە بووم کە تەیارەی ڕووسی دەهات بۆ کوتای پێشمەرگە، برا شیووعییەکان گەش دەبوونەوە، بەڵام کە ناوناوەتەیارەی ئینگلیزی دەهات لە مجێزیان خۆش نەبوو..ز بە هەمە حاڵ، مەنتیقی ڕواڵەتی وەها چاوەڕوان دەکات کە ((دەوڵەت)) بە گۆڕانی ڕێژیمی حوکمی لایەنی((بەرژەوەند)) لە بیر نەکات. بەو پێیە دەبێ ڕووسیا خۆی و وردە دەوڵەتەکانی پێوەی نووسابوون چاو ببڕنە سیاسەتێکی سوودی خۆیانی تێدا ببینن، ئیتر ئازەرییەکان، لە نموونەدا، گوێ نەدەنە ورتەورتی ڕەگەزپەرستیی دژی کورد/ مادەم لە باری ئێستاکەی هەرای((نا گۆڕنۆی کەرەباغ)دا یەخەگیری دوژمنێکی مزرۆکە بوون. کەچی ئازەری، کوردی گوتەنی، نەزمێکی دەزانێ ئەویش سێ پێیی!! تا ئەوەی تیپی هونەرییان هاتبووە بەغدا لە نێوانیاندا خزمەتچییان هەبوو بە دزییەوە کورد بوو، داوای لە کوردی بەغدا کرد چەند کاسێتێکی گۆرانیی کوردیی بدەنێ بۆ باوکی کە زۆر تامەزرۆیە بەڵام نەکەن خوازەکەی ئاشکرا بکەن دەنا ئازەرییەکان خراپی بەسەر دەهێنن... هەرچۆنێك بێت ئێستاکە دوای دەرچوونی مەسەلەی کورد لە قاڵبی بابەتێکی ئینسانی و چۆتە قاڵبی سیاسیی نێودەوڵەتان، ڕەفتار و کرداری خۆی و سیاسەتمەدارییەکی لەگەڵ دنیای بەرێوە دەبات گرنییەکی نوێی بێ سابیقەی وەرگرتووە کە حیسابی بۆ دەکرێت لەلایەن ئەو هێزانەی دەستیان لە سیاسەتی عالەمی دەڕوات... منداڵبازاڕی و بمرێ خوێنمژ و ئیستعمار و بژی فریشتەی باڵ ژەنگار و ڕۆحم ب سەدەقەی جوتیار و کرێکار مام سۆفی ئاودەلی بە ویقار، ئا ئەم قەوانە سافیلکانەی بە زمانی بوورسە و نەوت و تیجارەت و تەکنیك و قسەی زێدە قەڵەوی سەر بە ژین و مەرگی جیهان، دەست لە چارەنووس و مافی ڕەوا و بێگەردی کورد لە ەبکارهێنانی خوازی...و...و...هتد بشۆ.

ڕاستییەکەی ئەگەر بە عەقڵییەتی بژی بڕمێ کۆردستان ئاوەدان بکرێتەوە هەر خۆی کوردەکە، لە جیاتی ئازەری و ئێران و نازانم کێوە، دەماری خۆی دەردەکێشێت و دەمارەکەش دەکاتە تەقەڵی دروومانی ئەو کفتەی خۆی بە بە ژنی خۆی هەڵبڕیوە...دەڵێن قانوون پارێزگاریی ئەحمەق ناکات، ئەشەدوبیللا فریشتەش حەقی نییە پەرۆشی بابایەکی هەبێت کەلکەدارێك دەبڕێتەوە خۆی دوو لینگانەی پێدا شۆڕکردۆتەوە.. دەبێ بزانین لە ڕێی قیاس لە خۆکردنەوەی کە چەند بە زەحمەت لەسەر بێگانە دەکەینەوە، ئەو میللەتە پێشکەوتووانەی کە ئێمەش چاومان لە دەستیانە زەحمەتتر دەتوانن یاریدەی کوردێك بدەن کە بە ئەسڵ بارە لەسەر شانینا و چ سوودێك لە خزمەتکردنیان نابینن، ئەوجا ئەگەر هات و مامە کورد خۆی لە دنیای پێشکەوتوو گێل کرد و دەستی کرد بە لووشکە هاویشتن و گروگاڵی ئەحمەقانە.. ئا بە خێری خۆت ڕستەکەم بۆ تەواو بکە..

سەرچاوە: ، هەڵۆ بەرزنجی, پەرژینی بێدەنگی, لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵی فەرهەنگی سوید، ١٩٩٦.

دیداری رامان لەگەڵ مەسعود محەمەد:

# بە غەیری ئیمان بەحەق کە لە منداڵییەوە بۆم ماوەتەوە، کەس نییە لە ژێر تەئسیریدا بم

هەڤپەیڤینی: ئازاد عەبدولواحید

**مەسعود محەمەد:**

**بە غەیری ئیمان بەحەق، کە لە منداڵییەوە بۆم ماوەتەوە، کەس نییە لەژێر تەئسیریدا بم**

***رامان:*** دیمانەی ئەمجارەمان لەگەڵ کەسایەتییەکی ناسراوی کوردە کە ئەویش مامۆستا "مەسعود محەمەد"ە، مامۆستا چ وەك رۆشنبیرو هزرڤانێکی کورد، چ وەك خاوەن بیروڕاو بۆچوونی تایبەت بەخۆی لەلای هەموولایەك ناسراوە، کە کوڕی زاناو شاعیری ناسراو مەلا محەمەدی کۆیەیە، لە بنەماڵەی جەلی-زادەی نیشتمانپەروەرو رووناکبیر پێگەییوە.

مامۆستا لە بواری ئەدەب و سیاسەت و فیکر بە زمانی عەرەبی و کوردی خاوەنی چەندین کتێب و بابەتی پڕ بایەخە، کە سەرجەم ئەو کتێبانە کەلێنێکی گەورەیان لە کتێبخانەی کوردیدا پڕکردۆتەوە، ئەو کەسایەتییە فیکری و رۆشنبیرییە لەبەر گرنگی و زیندوویی بیروڕایەکانی تا بە ئەمڕۆش دەگا بیروڕایەکانی جێگەی گفتوگۆو مشتومڕن.

مەسعود محەمەد: زۆر سوپاس بۆ ئەو موجامەلەیەی تۆ دەیفەرمووی.

***رامان:*** ئەوە تەوازوعی خۆتانە.. سەرەتا حەز دەکەین باسی ئەوەمان بۆ بکەیت ئەو ژینگەو بنەماڵەیەی تێیدا پەروەردە بوویت، کاریگەریی لەسەر پێگەیاندنی هۆشیاری ئێوە چییەو چۆنە..؟

مەسعود محەمەد: من لە ماڵێکی وەك بڵێین رێزلێگیراو پەروەردە بووم، باوکم دەتوانم بڵێم نموونەی جورئەت و فیکری واسیع بوو، نموونەی چاکەو کوردایەتیش لەوێ راوەستێ، باوکم لە دوو لاوە کارتێکەر بوو بۆ سەر من، یەکێکیان هەر لە منداڵییەوە ئیمان بە حەق لە مندا بووە عەقیدەیەك تا ئەم رۆژە لەگەڵمدا دەژی.. دواتر کە گەیشتمە تەمەنی لێکدانەوەو خۆناسین، هەستی خۆ بەکەم زانین لەتەك شەخسییەتی باوکم شکاندمییەوە.. دەموت، چەندێکی خۆم هەڵباوێژم ناگەمە ئەژنۆی ئەو باوکە.. ئەو مرۆیەم وەك کێوێك دەهاتە بەرچاو کە لە هیچ بارێکی گۆڕاودا ناگۆڕێت.. چ لەگەڵ مەلیك بایەو چ لە ماڵی خۆی بەسەر سینی خواردەمەنییەوە بایەو.. لە دەرسی فەقێیان.. لەگەڵ خەڵك و خوا یەك وێنەو یەك ڕەفتاری هەبوو، بەسەر هەموو هەڵوەستێکدا زاڵ بوو، ساڵەهای ساڵ خەریك بووم لە وەهمی ئەو خۆبەکەمزانینە دەربچم، لە دوو هەڵوێستی گرینگ نەمتوانی بە دەنگ بێم، لەبەر ئەو ترسەی کە بێجورئەتی پەکم بخات "یەکێك لەو مەوقیفانە، دوای سێ ساڵ پاش مەرگی باوکم، ئەوە بوو کە (وەصی- عەبدولئیلاه) لە پاش چوونی بارزانییەکان بۆ ئێران ساڵی-١٩٤٦- سەردانی ناوچەکەی کردو لە هەولێر ئاهەنگی بۆ گێڕراو کوردێکی خۆفرۆش، موبارەکبادی زاڵبوونی لێکرد.. ترسەکەی باوکم نەبوایە، بێگومان، بەرپەرچێکم دەدایەوە".

دەمزانی ئەگەر باوکم لەو مەوقیفانە بایە مەوقیفەکان روویان نەدەدا، چونکە کەس لە حزووری ئەودا نەیدەتوانی پێ لێ هەڵکێشێت و سنوور ببەزێنێت، کەواتە من قەرزداری باوکمم لە ئیمان هێنان بە حەق و ڕاستی.. زەدەی شەخسییەتیشی بووم کە دەمزانی بەو ناگەم..

***رامان:*** جەنابت بەوە ناسراویت کە رۆشنبیرێکی سەریح و بوێری لە بۆچوونەکانی خۆت، ئایا لەو بوێری و سەراحەتە قەرزداری باوکت نیت؟

مەسعود محەمەد: عەرزم کردی، بوێری لە باوکمەوە بوو بە دەرسی یەکەمم لە ئیمان بە حەق.. عامیلی ئەساسی لە تەکوینی مندا..

***رامان:*** خەسڵەتێکی تر لە لای ئێوەدا کە باسی لێو دەکرێ، دەڵێن مامۆستا زۆر گۆشەگیرە، هۆیەکەش ئەوەیە کە خەریکی خوێندنەوەو نووسینی؟

مەسعود محەمەد: قسەکەت ڕاستە، من گۆشەگیرم، بەلاّم نەك وەك تەبیعەتی دەروێشی، نەخێر ئەو شتەی کە خەڵك دەوروژێنیّ، بێرەو بەوێدا دەیبات، سەر بەوێدا دەکەن‌و سەر بێرەدا دەکەن، ئەمن ئەوەم لە لانییە، هیچ شتێکی ئەو دنیایە ڕامناکێشیّ، زۆر لە مێژە ئەمن دنیا نامکێشیّ، ئینجا کە دنیا نەمکێشیّ بۆ بچم سەر بەویّ‌و بێرەدا بنێم‌و خۆم هەڵقورتێنم، ئەمن خوا خوامە ئەوانەی سیاسەتمەداری گەورەن‌و مەلیکن نەیانبینم، وا تەصادوفی کرد چەند کەسێك لەوانە وەك (جەمال عەبدولناسرو مەلیك حوسێن‌و حکوومەتی شای ئێران‌و سەدام حوسێن) هەموویان دەعوەتیان کردووم، وەڵلاّهی نەچوومە دەعوەتی کەسیان، تەبعەن ناڵێم ئەوانە هیچن.. فەقەت شتێکم هێناوەتە پێش کە مانیعی چوونەکەم بووە، لەبەرئەوە وەك وتم: ئیمانم بە حەق هێناوە وەك بڵێی چاولێکەری یا تەتەبوع بووە یان تەئسیرو ئیلهام وەرگرتن کە من بە دوای دنیادا نەگەڕێم‌و خەریکی نووسین بم، دەمێنێتەوە گۆشەگیری، بە تایبەتی کە پیاو بەتەمەندا چوو، چل وپەنجام تێپەڕاندووە ئەی نابیّ گۆشەگیر بم، خۆ لە سەری کۆلاّن نووسین ناکریّ‌و لە جێی قەرەباڵغ ناکریّ، لە دیوەخانان نووسین ناکریّ، ئێستە تەمەنم(٧٨) ساڵە.

ڕامان: جەنابتان کتێبێکی پڕ بایەختان هەیە لەسەر (حاجی قادری کۆیی)و تا ئێستەش سیّ بەشی لیّ دەرچووە، ئەو کتێبە فراوانترین کتێبە کە بە قووڵی دیراسەی حاجی قادرو بارودۆخی ئەو سەردەمەو بیئەی حاجی قادری تێدا کرابێت، زۆر کەس پێیان وایە ئەو کتێبە ئەوەندەی قووڵکردنەوەی بیروڕای خۆتە بەرانبەر بە کوردو بیری نەتەوایەتی، ئەوەندە لەسەر حاجی قادری کۆیی نییە.. وەلاّمت بۆ ئەوە چییە؟

مەسعود محەمەد: وەلاّمەکەم ئەوەیە هەستم بەوە نەکردووە من وا بم، داخوازی نووسینەکە لەگەڵ دەنگدانەوەی دەروون ئەوەی پیّ نووسیم، شتێکی تایبەتی نییە منی پاڵ پێوە نابیّ بۆ ئەو نووسینە، شتێکە بیرو باوەڕم بووە، من ئەوهام، ئەوە باوەڕمە، قسە کە دێت لە پەنا حاجی قادرو لە پەنا باوکمەوە بێت قسەکە ناخۆمەوە، ئەو شەخسەی وەها دەڵیّ با سەیرێکی (إعادە التوازن)و (تفسیری بشری)و (مرۆڤ و دەوروبەر) بکات.. با گوتارەکانم بخوێنێتەوە، چ پەناو پێچییان تێدا نییە.

***ڕامان:*** هەندیّ لە برادەرە ئەکادیمییەکان‌و خەڵکانی تریش گلەییان لە نووسینی جەنابتە دەڵێن سەرچاوە بەکار ناهێنیّ‌و بە یەك نەفەس شت دەنووسی، تۆ دەڵێی چی؟

مەسعود محەمەد: ئەوان کەیفی خۆیانە، من ئەوەم کردووە کە کردوومە، جەنابت مومکینە تەسەور بکەی کە ماڵەکەم پڕ لە کتێبی عەجایب‌و غەرائیبە! ئەشەدومابیلا تا کتێبەکانی خۆم لە ماڵەکەی خۆمدا نییە، (٨٠٪)ی نووسینی خۆمم لە ماڵەکەمدا نییە، مەکتەبەمان هەبوەو سووتاوە، پاشان کتێبی ئەو کاتە هەر زانستی ئیسلامی‌و ئەو شتانەیە، من سەرچاوەم یەکجار کەمە، ئێستە موحتاجی هەندیّ لە ریازیاتی عولیام دەستم بە کەسڕا ناگا، لەو دەپرسم، پێویستم بەوە بوو لە (فەلەك) هەندیّ عوقدە هەبوو لام، ئەوەی فەلەکیشی دەزانی عوقدەکەی نەدەزانی، هەر نەیانبیستبوو، دوایی خۆم لەگەڵ خۆمدا حەلم کرد.. من ئیمانم بە شتیّ هەیە: کە رایەکی فرۆیدە خۆم لە خۆمدا ئەوەم دی بە منداڵی‌و هەڵکشاویش لە مندا شتێك هەبوو، عوقدەیەك هەبوو لە هیکڕا دەکراوە بۆم بەبیّ ئەوەی تێفکرم، جاریّ نا دووجار تا گەیشتمە مەقالەیەکی فرۆید تێیدا دەڵیّ هۆشی ون هەموو ئەو گرێیانەی کە هۆشی ئاگا حەلیان ناکات لە ژوورەوە خەریکی حەل کردنیان دەبیّ، ڕۆژی لە ڕۆژان پرسیاریّ کە دەیبیستی (٥-١٠) ساڵە خەیاڵت بۆی نەچووە، لەپڕ کەشف بووە، لەوانەیە ئەوە لای من هەندیّ ساناو چالاك بیّ کە لەلای خەڵکی تریش هەیە، هەندیّ کەس لەوەدا دەگاتە قۆناغی ئیلهام لەپڕ دە شت بە دوای یەکدا کەشف دەبن، ئەمن ئەوەم نییە، بەلاّم هۆشی ونم چالاکە، بۆیە لەلایەکەوە بێدەسەلاّتم لە دەست گەیشتن بە سەرچاوە، لە لایەکیشەوە ئەمن خەریکی کیمیاو فیزیاو شتی وانیم، زیاتر خەریکی زمان‌و مێژووو ئەدەب‌و ئیجتماعم کە ئەو شتانە بۆ خۆم بیّ سەرچاوە دەتوانم قسەیان تێدا بکەم.

رامان: جگە لەوەی (فرۆید) کە باسی دەکەی کە لە لای فرۆید بە (ئەقڵی باتن) ناو نراوە، ئایا ئەمە پێوەندی بەوەوە نییە کە ماوەیەك لە ژیانی خۆت بۆ تەئەمولات تەرخان کردبیّ؟

مەسعود محەمەد: من لە (١٩٤٥) تا (١٩٥٢) ئەو حەوت ساڵە هەر بە تەئەمولەوە خەریك بووم، ئێستەش لە بیرمە یەك لە شتە بنچینەییەکانی لەگەڵ من دەژی لە نووسینم ڕەنگی داوەتەوەو لە نووسینێکمدا نووسیمە"لیس قصاری العقل ان یمتنع تفسیر الاشیاء التی لایفهمها، انما یفسرها تفسیرات خاطئة.." ئەم قسەیە هەموو ئەفسانەکان تەفسیر دەکات، بۆ نموونە برووسکە دەبینیّ نازانیّ چییە، دەڵیّ قەمچی مەلائیکەتان لێی دا، بوومەلەرزە دیّ‌و دەڵیّ گا لە بن ئەرزەو دەیهەژێنیّ، هەموو ئەو شتانەی کە تێی ناگات بیّ جەواب دەمێنیّ، چونکە غەریزە داوای جەواب ناکات، تەنیا ئەقڵ تەفسیری ژیرانە داوا دەکات، بەلاّم ئەقڵیّ لە زانکۆ بیّ لەگەڵ ئەقڵیّ لە دەشتی بتوێن بیّ فەرقی زۆرە، ئەوەی ئەقڵ دەوروژێنیّ چۆڵ‌و بەڕیە نییە، تا ئێستە (ئەسکێمو) نەیزانیوە کاغەز بنووسیّ زمانی خۆی هەر لە خەڵکی وەردەگرت، ئەو لایەنی تەئەمولی زاتیە زۆر دەوری هەبوە لە ژیانم، بڕوا بفەرموو زۆرترین نوکاتی شیعری نالی کە من زانیومە لەو لایەنە بووە، یەعنی لە پڕ مانایەکەیم زانیوە بیّ

ئەوەی تێفکرم لە دوورەوە لەگەڵم ژیاوە، بەڵام لە بیرم نییە کەی بۆی تێفکریوم..

*ڕامان:* هەندێ تێڕوانینت تەرح کردبوو بە تایبەتی ئەوەی لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) بلاْوت کردەوە، باسی قۆناغی پەرەسەندنی کۆمەڵت کردبوو، تیایدا باری سەرنجی خۆت هەبوو بە تایبەتی لەسەر قۆناغی کۆیلایەتی، تۆ کۆیلایەتی بە "دیاردە" دادەنێی نەك بە "قۆناغ"، ئێستە چ دەڵێی..؟

مسعوود محەمەد: فیعلەن"دیاردەیە"و "قۆناغ" نییە..

*ڕامان:* ئنجا ئەمە یەك لەو بیروڕا نوێیانەیە كە بەرپەرچێكی قۆناغەكانی پەرەسەندنی كۆمەڵە كە كراوە بە (٥) قۆناغ..

مەسعود محەمەد: ئاخر من چی لێ بکەم، زۆر زۆر کۆمەڵگە هەبووە نەیزانیوە عەبد چییە؟ عەبدایەتی شتێك نییە بە ملی کۆمەڵگەوە بووبێ هەروەك مەسەلەن زراعەتو شارستانیەتیو مواسەلاْت بەم شێوەیە، ئەمما ئیللا دەبێ کۆیلە بێ؟ شەرت نییە...

*ڕامان:* مامۆستا وتاری ترت هەیە بەناوی- یا حكام العلم إتحدوا یا عمال العالم إختلفو- ئەمە کاتی خۆی "رد فعل"ی زۆری هەبوو، تۆ ڕات وابوو ئەگەر دەسەلاْتدارانی جیهان یەك بگرن، ئەوە چینو توێژەکانی تریش یەکدەگرن، ئێستەش هەر ڕاتان وایە..؟

مەسعود محەمەد: "یا عمال العالم إتحدوا" چی کردو چی پێکرا! هەر ئەوە نەبوو لە دوای دەیان ساڵ خۆی تەسلیمی ستالین کردو دوایی وەك عەبد لێیانی خوڕی.. یان بە تایبەتی کرێکارانی کوردستانو عەرەبستان چەندن؟ پێم ناڵێیت؟

بڕۆوە بۆ نووسینەکە دەزانیت من دەمەوێ هۆشی داخراو ڕەها بکەم.. سەرۆکێکی ڕۆژهەلاْت بەهێزترە لە دوو هێندەی میللەتەکەی تا ئەوەی لەوێدا وتوومە "فلَوْ وَضَعوا مَكانهُ عجلاً جسداً لَهُ خوارٌ لَأَطاعَهُ الناس فيما لا يُستطاع"..

*ڕامان:* جەنابت بۆ مێژوو- تەفسیری بەشەریت- پێ ڕاستە؟!

مەسعود محەمەد: پاش ئەوەی لێت مەعلوم بوو ئالەت دروست دەکەیت، ئەوەی ئالەتیش دروست دەکات هەزاران کەس نییە، موبدیعەکانن، پاش ئەوەی کە زانیت ئینسان خاڵقی شارستانییەتە، ئەی چۆنە تۆ دەڵێی وەسائیلی ئینتاج ئینسان پێش دەخات، وەسائیلی ئینتاج ئینسان پێشی دەخاتو دواتر یاساو قەواعیدی بۆ دادەنێ، گەلێ جاران لێی بە سەهوو دەچێت، زۆرجاران "پەرلەمان" شتێك دادەنێت تێی ناگات، ئەو ئالەتە قانون بۆ خۆی دروست ناکات، مەسەلەن گاجووت یان گاسن بڵێ: هۆ ساحێب زەوییەکە ئەوهاو ئەوهام لێ بکە، نییە شتی وا. یاساو غەیرە یاساو پێشکەوتنو پاشکەوتن هەمووی تایبەتە بە ئینسان، ئالەتی بەسەزمان مەوزوعی بەشەرە، من دەڵێم لە جیاتی بڵێی-بتطور وسائل الانتاج یتطور نازانم چیو چی، بڵێی الانسان خالق العمل الاجتماعي- بەشەرەکە عەمەلی ئیجتماعی دروست دەکات، تەبیعی لە حەیوانات غەریزە هەیە ئیجتماعیات نییە، لای ئینسان هەیە، کە دەڵێی "ئیجتماع" مێژووو زانستو زانیاریو زمان دەگرێتەوە هەمووی ئیجتماعی ئینسلنە، چیت پێ بڵێم قوربان، ئاخر ئالەتی بەستەزمان چی دەکا! بەڵێ ئالەت کە بلاْو بۆوە، مرۆڤ بە پێی داخوازی ئەو ئالەتە کە موختەریع دروستی کردووەو بازرگانێ هێناویەتە بازاڕو جیهەتێکی بانك تەغذیەی دەکا، خۆ ئەوە هەروا لە خۆڕایی پەیدا نابێ، تۆش کە ئۆتۆمبێلێ پەیدا بوو ناچی چەقۆ لە تایەکەی بدەی، هەڵبەتە دەبێ ئاگات لێ بێ، مانای ئەوە نییە کە تۆ مەجبوور بووی کەرێك ئالیك بدەی لە لایەن کەرەوە ڕاکێشرێی، خۆ جۆ بە کەرەکە نەدەی دەتۆپێ، ئەگەر گاسنەکەی تیژ نەکەمەوە دەوەستێ.. مەبەستم، کە دەڵێ "یتطور وسائل الانتاج.." وەك ئەوەیە کە ئینتاجەکە لە خۆڕا تطور بکات، کەچی عەقڵی ئینسانیو عولەماو داخوازیو ئارەزووی تەمەلوكو نازانم چیو ئارەزووی قازانجو سەوداو مامەڵە پێشی دەخات.

*ڕامان:* لە نووسینی کوردیدا بە تایبەتی لەم بیست ساڵەی دوایی زۆر هەن دەیانەوێ هەندێ چەمكو بیروڕای دەرەوە بهێننو لەسەر واقیعی ئەمڕۆی کورد بیسەپێنن، بۆ نموونە یەکێ لەو شتانەی کە جەنابت لە کتێبی "حەمە ئاغا" ڕوونت کردۆتەوە، لایەنی عەشائرییە کە گوایە خزمەتی کوردی نەکردووەو لەو کتێبەدا هەندێ مەفاهیمت ڕوون کردۆتەوە پێت وایە ئەو مەفاهیمانە ئەمڕۆ چەند خزمەتی ئێمە دەکەن..؟

مەسعود محەمەد: قسە قسە دەهێنی، سەرۆك عەشیرەت تا ئەو ئاخیرانە لەگەڵ عەشیرەتی خۆیان خیانەتیان نەدەکرد، ئەوەی پێوەندی عەشیرەتی هەبووە، عەشیرەتەکە وەك باوك سەیری سەرۆکی عەشیرەتەکەی دەکرد، ئەگەر وای نەکردبا عەشیرەتەکانی دەوروبەری دەیانخوارد، بە داخەوە ئەویش ئەنجامی نەبوونی کیانی کوردە، پێویست بوو پێش "٢٠٠-٣٠٠" ساڵ، پێوەندی عەشایری نەمێنی، بەلاّم ماوە، تا ئەو ڕادەیەی سەرۆکی عەشیرەت خزمەتی عەشیرەتەکەی دەکرد، چونکە سەرۆکی عەشیرەت لەگەڵ عەشیرەتەکەی خیانەتی نەدەکرد، لەو دواییە وای لێ هات ئەو پێوەندییە هەڵوەشا، ئەوسا سەرۆکی عەشیرەت بووە جەللادی عەشیرەتەکەیو بەداخەوە قیەمی عەشایریش نەما.

*ڕامان:* ئەو بیرو بۆچوونانەی جەنابت سەبارەت بەوەی کە کۆیلایەتیت بە دیاردەیەك داناوەو لە هەموو قۆناغەکاندا دوبارە دەبنەوەو تا تەفسیری بەشەری بۆ مێژوو، تا ئەوەی یەکگرتنی سەرکردەکانی دنیا زۆرجار لە قازانجی کرێکاریشدایە، چونکە

کرێکار هیچ دەسەڵاتێکی نییە لە گۆڕینی دنیا، ئەمە هەمووی ئەنجامی تاقیکردنەوەو خوێندنەوەیە یان لە ئەنجامی تەئەمولاتەوە هاتوون؟

مەسعود محەمەد: هەڵبەتە من بە تەحەدی ئەو ئەفکارەوە ئەو وتەیە دەڵێم "یا حکام العالم اتحدوا یا عمال العالم اختلفو" ئەمە بە تەحەدی ئەو نەهجەوە کە لە ڕێی پرۆلیتاریاوە دەیەوێ دنیا بکاتە شامی شەریف، تەبیعی دەسەڵات لە دەست حکومەتدایە، بە تایبەتی لەم دنیایەی ئێمەدا کە دنیای جیهانی سێیەمو شەشەمو حەوتەمیش نییە..

لەم وڵاتانەدا لە سەرۆکەکەی بەولاوە کێ هەیە هیچی بەدەست بێ، هەندێ پێوەندی دەرەکی هەیە سەرۆك ناچار دەکا بۆ سەردانەواندنو شتی تر، بەڵام لە داخیل ئەوەی پێی دەکرێ هەر بۆ خۆی دەکات، لە جێگەیەکدا نووسیومە زۆر بە ئەنتیکەیی ئاماژەم پێ داوە، دەڵێم ئەو کەسەی کە گیانفیدایی دەکاتو دەیەوێ بگاتە مەقامی ریئاسەت، بیزانیبایە دەچێتە سەر بانکێکی موفلیس، قەت ڕۆحی خۆی نەدەخستە تەهلەکە، ئەگەر مەجبور بایە دەسەڵاتو پارەش لەگەڵ خۆی بباتە ئەوێ، لزومی نەبوو بۆ ئەو بانکە موفلیسە هەڵکوتێ، ئەو مەزایایەی کە تێیدا وا دەکات ئەو خەڵکە موونافیس بێ لەسەر داگیرکردنی ریئاسەت، تەبیعی لەگەڵ هەندێ تەفسیرات، تەبعەن خۆی هەموو شتێکەو دەسەڵاتو پارەی هەیە (فلو وضعوا مکانه عجلا جسدا لهُ خوار، لأطاعه الناس فیما لا یستطاع) وەك پێشتر وتم..

*ڕامان:* ئێمە وەك کورد بەگشتی لەئاستی ڕوداوەکاندا نین، ئەوەی پێویست بوو لە ئاستی ڕوداو بێ نوخبەی ڕۆشنبیرانە، بەداخەوە ڕۆشنبیری کوردیش لە ئاستی ڕووداوەکاندا نین، هۆی ئەمە بۆچی دەگێڕیتەوە؟؟

مەسعود محەمەد: هۆی ئەمە مێژووی کوردە. دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە خاوەنی کیانو ماڵی خۆی نییە، ئەگەر لەبیرت بێ لە "اعادە التوازن الی المیزان المختل" لە جێگەیەکدا لەسەر وەزعی کورد نووسیومە "فنحن مرعی بلا سیاج و حی بلا دیدان وضیعة خلت من فزاعة الطیور) ئێمە بەڕەڵڵاین هیچمان نییە، بەبێ ئەوەی کیانێ هەبێ، کورد بەتەمای چییە، مانای تا کیانت نەبێ "نرخی سەر بە نەتەوە" زۆر زەحمەتە دروست بێ، تۆ وڵاتێکت نەبێ لە نەخشە نوقتەی بۆ کێشرابێ، ناچار نابیت بیپارێزی، مەسەلەن پێش "١٠٠٠" ساڵ کابرایەکی ئەرزەڕۆمی ئەوسا قەت بە خەیاڵیدا نەدەهات خەم بخوا لە مەسەلەی "سنە"، هەر نەیدەزانی "سنە" چییە، ئەو نیشتمانی خۆی نەدەناسی، بەرلەوەی تۆ کیانت هەبێ، وەك مەحاڵ وایە بیرت بۆ هەندەران بچێت، کە دەڵێم "موستەحیل" قسەکە قورسە، بەڵام بابەتەکەش زۆر مەترسیدارو گرنگە، کابرایەکی ڕۆشنبیر دەتوانێ لە ماڵی خۆی بەناموس بێو لەبەر خەڵك شتی خراپ نەکاو ئەرکی خۆی ڕاپەڕێنی، ڕەنگە بتوانێ ئەوانە هەمووی بکات، بەڵام ئەوە ئاستی ڕووداو نییە، پێویستە تۆ یەخەی دەسەڵاتدارو حزب بگری یا تووڕە بی لە پۆلیسان، باری ئێستاکەی کوردستانی عێراق زۆر دوورە لەو قۆناغە کە یەکێ بێ یەخەی حکومەت بگرێو بڵێ پشتی برۆت کلی پێوەیە، ڕەنگە بەعزێ کەس سەرۆکی حزبێکە یان سەرۆکی شوێنێکە ڕێزی بگرێ، بەڵام بە ڕۆشنبیری ئاسایی دەگوترێ پێ بەقەد بەڕەی خۆت ڕاکێشە، لەوە زیاتر قبووڵ ناکرێت. بڵێین ڕۆشنبیر لە ئاستی ڕووداودا بێ دەورو بەرەکەی لێی ناگەڕێنو بوار نادەن.. واقیع لێی ناسەلمێنێ.

ڕامان: ئێمە وەك کورد، ڕۆشنبیرییەکەمان پێویستی بەوەیە ناسنامەی خۆی هەبێ، تا ئێستە کورد نەیتوانیوە ناسنامەی ڕۆشنبیریی خۆی هەبێ، بە ڕای جەنابت ئەگەر نییە چ بکرێ باشە بۆ ئەوەی ئەو ناسنامە ڕۆشنبیرییەی خۆمان هەبێو پێی بناسرێتەوەو لەسەر زەمینەیەکی ئەوەندە پتەو بێ ڕۆشنبیری گەلانی تر نەتوانێ لوولی بداو بیسڕێتەوە؟

مەسعود محەمەد: مەسەلەکە دەتکێشێتەوە بۆ لای مێژوو، جەنابت ئەگەر سەرنج بدەی بەر لە "١٠٠–١٥٠" ساڵ، بەرلەوەی نالیو سالمو چەند شاعیرێك شیعری کوردی دابنێن، دەنا لە هەموو مێژووی کورد نووسراوت بە کوردی نییە، ڕۆشنبیری کورد یا بە عەرەبی یا بە فارسی نووسیویەتی، لەوەتەی فارسی هەیەو پێش ئەویش لەوەتەی عەرەبی هەیە.. کورد مەلای گەورەی هەبووە، بە کوردی کتێبی عەرەبی گوتۆتەوە، تۆ بە درێژایی مێژوو نوسینی کوردیت نییە، ئنجا ڕۆشنبیر؟!

ئێمە تا رابردووی نزیك نووسینمان نەبوو، پێش "٧٠–٩٠" ساڵێك لەناو مەکتەبەکان دەستی پێ کرا، بە تایبەت لە سلێمانیو لە کۆیەو دەوروبەری، هەندێ کتێب دەرچوون، بەری بادینان هەر نەیدەدیت.

ئنجا بە زمانێك دەیدیت کە ئەو خۆی تێی نەدەگەیشت، ئەگەر لەبەری بادینانیشەوە بە زمانی سەروو کتێبیان بۆ سلێمانی بناردایە، هەر نەدەزانرا بخوێنرێتەوە، تۆ زمانی ئەدەبی یەککگرتووت نییە، ئەگەر ئێستە لە بەری بادینان بهاتنایە بە زمانی سەروو کتێبیان بۆ سلێمانی بناردایە نەیدەزانی چۆنی بخوێنێتەوە، خۆ تا ئێستە زمانی ئەدەبی یەککگرتووت نییە، تا ئێستە لەسەر زاراوە پێکەوە ڕێك نەکەوتووین، ئنجا ناسنامە دروست کردن چۆن دادەنرێ؟

ئەگەر بۆمان بشێتو خەریکی بیناکردنی بین، جارێ لە بناغەی هەڵنانی شتەکە دەبین، ئەویش بەبێ ڕابەر تۆ لە ئەساسیاتی شتەکەدا خەریکی بۆ خۆت وەك ئینسانێکی باش، یاخود بە پێی ئیشەکەت یا مامۆستایەکی لە فلأنە جێ. تۆ یا من، خۆم وەك ئەو مێرووەم کە دان دەکێشێتەوە هەر ئەوەم پێ دەکرێ، تۆش هەروەهایت، ئەمما کەسایەتیو ناسنامەو ئەو شتانە دانامەزرێت ئەگەر ئەو نوقسانیانەی هەمانە نەڕوا، ئێستە گەلێك زوە بۆ ئەو هەنگاوە، دەبێ بیسەپێنین، سەپاندنەکە ئەوکات لەگەڵ یەکگرتنی فەرهەنگو زمانو لەهجە دەکرێ دامەزرێ، وەك نمونە بۆت دەگێڕمەوە: سالێك لە سالأن کۆبونەوەیەك هەبوو لە سلێمانی، داوەتنامەیەکم بۆ هات بەشداری تێدا بکەم بە مەرجێك چی بنووسرێتو بخوێنرێتەوە، پێویستە بەزاری سلێمانی بێت، ئەگەرنا مەرفوزە، ئنجا کەسایەتی چۆن پەیدا دەبێ؟!

ڕامان: وەك دەزانین جەنابت بە دوای ڕەسەنایەتی کورد کە دەگەڕێی، زۆرتر لەناو کەلەپووری یەزیدییەکانو کاکەییەکان هەوڵت داوە بیدۆزیتەوە؟

مەسعود محەمەد: هەر ئەوان نین، بەلأم ئەوانە هاتوونە بەر قەڵەمم، شتی تریش هەیە، ئەمما نەمتوانیوە تەفەروغ بکەم بۆیان، چونکە ئەو مەوزوعانە کە دەبێ قسەیان تێدا بکرێ، هێندە زۆرن بێ سنورە.. دەبینم شتی ئەوتۆ دەنووسرێن بە لای خۆمەوە هێندە کاڵو کرچن لێناگەڕێن کورك بم بە سەریانەوە.. من بلأوم بەسەر مەساحەیەکی زۆر فراواندا، بەسەر سیاسەتو ئەدەب و زمانو زاراوەو چەندان شتی تر..

***ڕامان:*** زۆر کەس تۆ بە مونەظیری کوردایەتی دادەنێ، کوردایەتی بە لای ئێوەوە تیۆر یان فەلسەفەیە؟

مەسعود محەمەد: کوردایەتی وجودە- بوونە- کەینوونەیە، لزوومی بە کراس نییە، لزوومی بەوە نییە پێستێکی لەبەر بکەی، کوردایەتی بریتییە لە حەقیقەتێك وەك کە خۆم ئینسانم هەروەها کوردم، چەند ئینسانم، چەند کوڕی باوکی خۆمم، ئەوەندەش کوردم، کوردایەتییەکە جورئەتێکی ئەصیلە لە من کە مومکین نییە بیسڕمەوە، لە کتێبی حەمید مەطبەعی کە لە بارەی منیەوە نووسیوە گوتوومە: خەڵك دەتوانێ لە دینی خۆی دەرچێ، لە وەتەنی خۆی دەرچێ، لە نازانم چی خۆی دەرچێ، بەلأم ناتوانێ لە قەومی خۆی بترازێ، ئەگەر کورد بێ ناتوانێ بڵی من کورد نیم، قوڕ بەسەری، کوردە مەگەر بیژوو بێ، چونکە بە میرات بۆی ماوەتەوە، کەواتە کوردایەتی ئەصیلترو بەهێزترە لە هەر وەسفێ بۆ مرۆی دەهێننەوە، من (مەسعود محەمەد)م ..تەواو.. فەقەت کوردم، چاریشم ناچارەو کوردم، ئیتر فەلسەفە لە کوێ بهێنم، کوردایەتیم تەرسیخ بکا یا جوانی بکاو باڵو شاخی لێ دروست بکات، کوردمو کورد حەقیقەتێکە بە ملمەوەیەو بە ملتەوەیەو وەك عەرەب، عەرەبەو عەرەبایەتی بە ملەوەیە.

***ڕامان:*** لە نێوان ڕۆشنبیری ئنسیکلوپیدیایی (مەوسوعی)و لە نێوان داواکردنی تەخەصوص، جەنابت زیاتر وەك ڕۆشنبیرێکی مەوسوعی ناسراوی کە لە زۆر بوار جێ دەستت دیارە، بەرانبەر بەو ڕایە چی دەڵێن کە داوای تەخەصوص دەکەن؟

مەسعود محەمەد: تەخەصوصم لێ داوا دەکا، بۆچیم لێ داوا دەکات، یەعنی ئستفتائێ کرا لەناو ڕۆشنبیری کورد کەوا جەوابی سوئالەکە دەداتەوە لەسەر چ فیکرەیەك کۆ دەبنەوەو لەسەر چ ڕەئیەك، تەخەصوص لە چ فیکرێکدا لە زمان، لە ئەدەب، لە مێژوو، لە فەلسەفە، یا ناوی بڵێ، ئێ چ بکەم من ئەو کابرایەم کە مەیدانم زۆرە، شت دێ لە بابەتی یەکێ تێیدا موتەخەصیصە ئاگای لەوی تر نییە، تەصادوف من ئاگام لەوی تریشە، ئیتر بڵێم چی نازانم چۆن خۆم تەسك بکەمەوە؟!

***ڕامان:*** باشە ئەو لێکدانەوە قووڵو فیکرە شموولییەی لای جەنابت خوڵقاوە لە چییەوە هەڵقولأوە؟

مەسعود محەمەد: قوربان قیسمێکی جیبیلییە- مەوروثە یەعنی وا تەصادوف دەکات یەکێك ئیتر لە بابی خۆیەتی، یا لە باپیرە گەورەیەتی.. ئەگەر بە صودفەیە یاخود بە هەرچی نەوعێك هەیە قابلییەتێ تێیدا دەڕسکێ دەیکاتە شاعیر، یا دەیکاتە وێنەگر، رەسام، یا بەنا، قابلییەتەو لە ئینساندا پەیدا دەبێ، لە مندا ئەو قابلییەتە هەیە، کە من وردم لەو شتانەدا..

***ڕامان:*** ئێستە باسی دایەلۆگی شارستانییەتەکان دەکرێ کە "هینتگتن" دایهێناوەو موناقەشەی زۆری دروست کردوە.. دایەلۆگی نێوان شارستانییەتەکان نەك لە لایەنی ئایدیۆلۆژیو ئابوری، بگرە لە لایەنی ڕۆشنبیریەوە دەستنیشان دەکرێ، "فۆکۆ یاما"ش یەکێکە لەوانەی ڕەخنەی لەو مەوزوعە گرتوە، لە پەنای تایبەتمەندی ڕۆشنبیریو ئەو تیۆرەوە دەیانەوێ دەستنیشانی مافی نەتەوەکان بکەن.

مەسعود محەمەد: ئەو قەومانە مەوجودن، حەضارات بۆ خۆیان ململانێ دەکەن یا ناکەن کەیفی خۆیانە، حقوقی بەشەر یا نەتەوەکان بۆ بەند بێ بە کۆبوونەوە لەسەر ڕایەك لە بابەت صراعی حەضارات، یەعنی بۆ ڕاستەوخۆ حەقەکانیان پێ نادەن، دیارە کێ وکێ وکێ، مەغدوورە خۆی ئەمەریکا یەك لە ئەسبابی مەغدووریەتی بەعزێ کەسانە، ئیتر صراعی حەضارات دەبێ بە شتێك یاخود فیکرەیەکی بەربلأوو لە هەر سەرچاوەیەکەوە بێ، بۆ خۆیشی دەستنیشانکراو نییە، خۆ شارستانییەت بینا نییە ئەبعادی هەبێ

شتێکە لە خەیاڵدایە، موکەوییناتی حەضارەتەکە زەحمەتە تۆ دەستنیشانی بکەی، ئەو صراعە لە بەینی ئەو حەضارەتانەی لە یەکتر ناگەن تۆ بڵێی لەسەر چ دەگیرسێنەوەو ئنجا دوای ئەوە بەرەکاتەکەی دەدەن بە فلأنە قەوم و فلأنە نازانم چی، تێناگەم چۆن حقوقی ئەقوام لەو ڕێگەیەوە دەدرێ، بۆ لە ڕێی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە نەدرێ، بۆ نایەت ئەو گەلانەی کە تا ئێستە کیانیان نەداوەتێ هەمووی ئاشکرایە دە بیاندەنێ، یەعنی ململانێی حەضارات ئەگەر تەپکەیەك نەبێ، بۆ شتەکە دوور دەخەنەوە..

ئەمەریکایەکی وا بە دەسەڵات، بۆ لێ دەگەڕێ پەنجا ساڵی دی خەڵك خەریك بێ داخوا کەنگێ صراعی حەضارات بلوجستان دەکاتە چی، من ئەوەم نەخوێندۆتەوە، بەڵام من هەروا بە خۆڕایی دژی ئەمەریکا نیم، ئەمەریکا بێ بڵێ ئێمە لە ڕێی صراعی حەضاراتەوە میللەتان ئاوهاو ئاوها لێ بکەین، ڕێی هەرە نزیکی دوور خستۆتەوە بۆ ڕێی هەرە دوور.. جەنابت خۆت باوەڕت پێی هەیە..؟

***ڕامان:*** ئەوە تەرحێکەو ئێستە هەیە؟

مەسعود محەمەد: لەگەڵ ئەوەی ڕەنگە قسەکەم زەق بێ، فەقەط ئەشەدوبیللا کە قسەی دەکەم لە بەینی ئیمکاناتێکی حازربەدەستو لە بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان، ئێستە (١٨٠) دەوڵەت هەیە با (١٥)ی تریشی بچێتە سەر، چ دەقەومێ، بۆ دەبێ تا "١٠٠" ساڵی تر ڕاوەستێ! تۆ نازانی صراعی حەضارات کەی دێ "شیر دا بۆ داپیر دا)

***ڕامان:*** پێت وایە ڕێبازی کوردایەتی لە کوێوە سەرچاوە هەڵدەگری؟

مەسعود محەمەد: پرسیارەکەت زۆر ئاسانەو گەلێکیش روونە، واتە سەرچاوە لە خۆیەوە وەردەگرێ، کوردایەتی سەرچاوەی لە کوردایەتیەوەیە، ئەگەر کورد بێو هەستێکی بە کوردایەتییەکەو هەستێکی بە بەرژەوەندیەکەوە هەبێ، ئەو شتە دەکاتە یارمەتیو ئەو هەستو باوەڕەی دڵنیا دەکات.

ڕامان: نوێخوازی لە هەموو بوارەکانی ژیانو فیکرو ڕۆشنبیری، تەئسیری خۆی کردوە، کورد وەك میللەتێك کە ئێستە بیەوێ خۆی نۆی بکاتەوەو بچێتە ناو ژیانی سەردەمەوە،دەبێ لە ڕێی نوێخوازییەوە بچێو جێدەستی هەبێ بۆئەوەی بتوانێ وەك میللەتێك لەو ئیزافاتانەی کە هەیە ئەویش بەشدار بێو دەوری خۆی ببینی، لە چ ڕێگەیەکەوە کورد دەتوانێ بە نوێخوازی بگات؟

مەسعود محەمەد: نوێخوازی واتایەکی زۆر بەرفراوانی هەیە، کوردیش وەك خۆت دەیناسیو خۆت دەیزانی تا ئێستە فرسەتی نەبووە نەك نوێخوازی، فرسەتی نەبووە وەك پێش "٢٠" ساڵ بژی، ئێستە ئەوەی لە دەست داوە کە ناتوانێ پێش بیست ساڵ بژی، ئەو نوێحوازییە لە جلکە، لە مۆدێلی سەیارەیە، لە هەرچی ناوی لێ دەنێی، ئەو کوردەی گەشایی پێش "٢٠" ساڵی لەدەست داوە تەحدیثەکەی دەبێ چی بێ! ئەوەی ئیشی بە دەستەو دەسەڵاتی هەیەو ئەوەی کە دەتوانێ گۆڕانکاریو تەحدیث بکاو مەنع بکا ئەوانن کە خاوەنی ڕەئین، ئەوانن ساحێب دڵخواز، ئەوانیش بۆ خۆت دەزانی وەزعەکەیان لە چ حاڵێکدایە، یەعنی پێیان ناکرێ لە بەینی خۆیان ڕێك بکەون، ئنجا لەسەر تەحدیثو نازانم چی چۆن دەکرێ؟ مەسەلەی تەحدیث مەوضوعێکە یا مەراقێکە لای منو لای تۆ کە مەراقمانە، بە لای منەوە ئەوە گەلێ دوورە قابیلی تەطبیق نییە.

***ڕامان:*** بێگومان ئەگەر کورد نەیتوانی تەفاعول لەگەڵ سەردەم بکاو لە ڕێی نوێخوازییەوە لەگەڵ سەردەمەکەداو لەگەڵ ئیقاعەکانی سەردەم نەتوانێ بڕوا، ئیتهام دەکرێ بە دواکەوتوو، کە نەتوانین ئەوە بکەین چ بکەین باشە.. پێت وایە دەستەوئەژنۆ بین! ئەدی دەسەڵاتی ڕۆشنبیر چییە؟

مەسعود محەمەد: بەشێکی زۆر ڕۆشنبیری کورد ڕای کردوەو چۆتە ئەوروپاو لە دەرەوەی کوردستانە، ئەوانەی تر کە ماون وەك جەنابت جوزئێکە لە کورد، جوزئێکە لە کیانێکی ڕەسمی، دەمێنێتەوە هەندێك ڕۆشنبیر، هەندێکیان کە غەیری شەخصی خۆیان بڕوا ناکەم هیچ مەنصەبیان هەبێ، بەعزێکیشیان هیچ ڕێیان نییە ئیش بکەن، لە کوێوە دەست درێژ بکەن لە بۆ تەحدیث یەخەی کێ بگرن، کابرایەك تا لێرە دەچێتە کۆیە یا لەوێ دێتە ئێرە "١٠" جاران دەپیشکنن، دووسەد جاران حەقارەت دەچێژێ، تەحدیث لە کوێیە! کاکی خۆم "ثبت العرش ثم انقش" ئەوانە مەراقی منو جەنابتن، لە ئەوروپاو نازانم کوێوە شتێ دێ ئێمەش حەزی لێ دەکەین وەك دادائیو سوریالی، ئێمە بە دەست خۆمانەوە گیرمان خواردوە، لەوەدا نین بە دڵخوازی خۆمان ئەو سێوە یان ئەو پرتەقاڵە بپچڕین، زۆر دورین لەو شتانەوە، من نامەوێ موخالیفی ویژدانی خۆم بم.

***ڕامان:*** پێمان چاکە لەو بابەتانە باری سەرنجتان ببیستین، چونکە ئەو بابەتانە بە گرنگ لە قەڵەم دەدرێنو لەسەر ڕووپەڕی گۆڤارو ڕۆژنامەکان زۆر باس دەکرێن، هەروا لە سمینارو کۆڕەکان زۆر تەئکیداتیان لەسەرە، بۆیە ئەو مەوزوعانە دەخەینە بەردەم جەنابت تا ڕای تایبەتی ئێوە ببستین..

مەسعود محەمەد: ڕای من ئەوەیە پیاو لە قەدەر بەرەی خۆی پێی بۆ ڕادەکێشرێو ڕۆشنبیریش بەرەکەی زۆر کورتە، سولطە لە دەست ئەحزابە، حزب ئەگەر شتێك بکاو بێ-نموودی بکاو ئەگەر ڕێ بداو

ئەگەر.. ئەگەر ئەوسا باسی نۆێکردنەوە مەعقولە، ئەگەر ڕۆشنبیری کورد هاتبا ئەوەندەی بە بەرەوە بیٚ وجودی بسەپێنیٚ بەسەر سولطەدا، جێی خۆی بوو ئەو قسەیە بکریٚ، بۆچی ئێستە ڕۆشنبیری کورد چەندیٚ لەگەڵ یەکتر ڕێکەو چەند تاقمن؟ ئێستە مەسەلەی کۆڕی زانیاری بەدەستەوەیە، پیاو نازانیٚ بۆ سلێمانی چی بکا، خۆ ناکریٚ تۆ کۆڕی زانیاری تەنیا بۆ هەولێر دابنێی، تۆ بۆ کوردی دادەنێی، ئایا سلێمانی قبوولٚ دەکات یان ناکات، ڕیٚ دەدات ئەندام لەویٚ بێتە ئێرە، یان بۆ جێگەیەکی تر، یا ڕیٚ نادات، ئێستە ئەوە کێشەیە، تەحدیثو ما تەحدیث گەلێك خۆ بە پاشەوە دەدات لە بەرانبەر ئەو گرفتانەی گەلیٚ ئاسانو پێویستە بە (٥) دەقیقە چارەسەر بکرێن.

*ڕامان:* لە گۆڤاری "مامۆستای کورد" ئەوەی لە سوید دەردەچیٚ، مامۆستا عەزیز محەمەد لە چاوپێکەوتنەی کە "فەرهاد شاکەلی" لەگەڵیدا کردبووی، دەڵیٚ لەو نووسەرانەی پێیان موعجیبم ناوی جەنابت دەبات، ئەی ئێوە ڕاتان بەرانبەر مامۆستا عەزیز محەمەد چییە؟

مەسعود محەمەد: وەك ئینسان زۆر حورمەتی دەگرم، جاریٚ خاوێنە دەشزانم تێدەگات، ئەمما بەداخەوە نوسینم کەم دیتوە، ثیقەم پێی هەیە، بە دڵی، بە شەخصیەتی، بە تێگەیشتنی، بە مەصڵەحەت بینینی، بە کوردایەتییەکەی، لە هەموو لایەکەوە خۆ بەشەر مەلائیکەت نییە، بەڵام چ عەیبی تێدا نابینم کە باسی بکەم، زۆر شتی تێدا دەبینم کە جێی مەدحە..

ڕامان: لە نێوان گرنگیدانی ئێوە بە نووسینی هیگڵو مارکسو گرنگیدان بە مەلای گەورەی باوکت، چۆن ئەو هاوکێشەیە تێدەگەی؟

مەسعود محەمەد: نایەتە بیرم خەریکی هیگڵ بووبم، دەشیٚ هەندیٚ شتی عابر هاتبێتە ناو نووسینم.. بە نیسبەت هاتنی ناوی هیگڵو مارکس لەگەڵ ناوی باوکمەوە، بێگومان باوکم موسڵمانێکی تەواو بوو، بەڵام ڕۆشنبیرانە. لە نموونەدا دەڵێم، لە کتێبێکی خۆی "المعجزات والکرامات" دا نووسیویەتی: شێخێك بەرماڵێکی ڕاخست لەسەر زیٚو پێی پەڕیەوە، لێی موبارەك بیٚ، بەڵام چاکتر ئەوەیە پردێك بکریٚ بەسەر زێوە خەڵكو ماڵاتو وسوڵاتی بەسەردا بپەڕێتەوە، من چی بکەم لە بەرماڵی کابرایەك ساڵی جارێك بە سەریدا دەپەڕێتەوە، باوکم لە واقیعدا مەلا بووە، ئەمما تا بڵێی لە عەلمانیەت نزیك بووە، مەبەستیشم لە عەلمانیەت واقیعیەتە.. مەصڵحەتی خەڵقە.. پێی دەوترا مەلای گەورە، بە ڕاستیش مەلای گەورە بوو, بۆ نموونە بەرانبەر بە ئافرەت دەڵیٚ:

ژن مامۆستای فیطرییە     تەشەککولت لەوییە

ماددی یا مەعنەوییە     روشدە یا لەڕیٚ لادان

کە دێتە سەر باسی منداڵەکەی دەڵیٚ:

کە دایکی چاکی نەبیٚ     سێصەد حەدیسی نەبیٚ

چلۆن تەئسیری دەبیٚ     وەك پڤ لە پەتكو سەندان

شێخێك لە شێخە ناودارەکان، لزووم نییە ناوی بهێنم، وێنەی خۆی هەناردبوو بۆ موریدەکانی لە ڕانیە، ئەوانیش سەجدە بۆ وێنەی شێخ دەبەن. باوکم لە پەراوێزی کتێبێکی خۆی دەنووسیٚ: کە هەر سەجدە دەبەن دەبوایە بۆ داهێنەری ئالەتی وێنەگری ببەن، شێخ چ هونەرێکی تێدا بەکار نەهێناوە..لە لایەن واقیعیەتەوە ئەگەر باوکم لەگەڵ مارکس ڕێك بکەوتایە شتێکی سەیر نەدەبوو، هەرچەند سەری بە مارکسیزمدا نەگرتبوو.. لە لایەن خەریکبوونم بە بیروڕاکانی مارکسەوە ئەوەندە بەسە بڵێم لە پاش جەنگی دووەمەوە بە لای کەمەوە لە سەدی نەوەدی ڕۆشنبیری کورد بوو بە دەروێشی مارکسیزم کە دەمزانی کۆمۆنیزم بابەتێك نییە مومکین بیٚ لە وێرانگەی کوردستان بڕۆیت، بە تایبەتی کۆمۆنیزمی بەرهەمی شۆڕشی جوتیارو کرێکار کە ئیمزای خۆیانیان پیٚ نەدەنوسرا، دەبوو کوردێك بە دەنگ بێت.. ڕێکەوت منی نامزەد کرد.. دەشزانم بایی ئەوەی بۆچوونەکانم بەرەو حەقیقەت بوون دوشمنایەتیی چەپی کوردی تیژتر دەکرد لێم، سەیر ئەوەیە حزبە شیوعییەکانی ئەوروپا وازیان هێنا لە فکرەی شۆڕشی پڕۆلیتاریا، برا شیوعییەکانی کورد پتر پەنجەی لیٚ گیر دەکەن، دەبیٚ بڵێم باوکم هەمیشە لای فەقیرو ڕەشو ڕووت بوو، قەت نەبووە لایەنگیری زۆردار بوو بیٚ، تا ڕۆژێکیان پیاوێکی فەقیرو یەکێکی دەوڵەمەند هاتنە لای باوکم شەرعیان هەبوو، کە شەرعەکەیان عەرزکرد، وتی ئەگەر بە ئیبنوحەجەر بیٚ حەقەکە بە لای ئەو فەقیرەیە، ئەگەر بە ئیبنولخەنجەر بیٚ حەقەکە بەلای ئەو دەوڵەمەندەیە، ئەو لەو بابەتە بوو.

*ڕامان:* لە نێوان خۆتو عەقاد نزیکییەك هەیە؟

مەسعود محەمەد: عەقاد ئەفکاری خۆی هەبوو، ئینجا لەگەڵی ڕێك ناکەوی یا دەکەویٚ شتێکی ترە، عەقاد خۆی فیکرو قەڵەمێکی زۆر بەهێزی هەبوو، تا من خۆم گەلێك نووسینی عەقادم داناوە بە "فتوحات" هێزی بیرو تەعبیری بەولای دەسەڵاتی هاوچەرخەکانی خۆیەوە بوو، تا جارێکیان لە پێشەکی کیتابی "ئیبلیس" شتێکم خوێندەوە، بۆ ماوەی چەند ساڵیٚ ئەو شتە بە لامەوە گەش بوو، دەڵیٚ: ئەو ڕۆژەی ئادەمیزاد ڕەمزێکی دانا بۆ شەڕ تا لەعنەتی لیٚ بکا کە ئیبلیسە، تا دروستیشی کردبیٚ بەدرۆ، دیسان ڕۆژێکی زۆر موبارەك بووە، چونکە لەعنەت لە خراپە دەکات بوتێکی بۆ دروست کردووە کە ئیبلیسە، دوایی لەعنەتی لیٚ دەکا، پاش چەند ساڵێك

فوجئەتەن ئەقڵی باطنیم لە خۆڕا بەخەبەر هات: خەیاڵم کردەوە وتم کابرا تۆ دەڵێی چی! ئەگەر ئیبلیس درۆ بێ هەرچی ئایینی ئاسمانییە هەمووی تێك دەچێ، هەرچی جیهادو صەومو صەلاتو زەکاتو حەج هەیە هەمووی دەسڕێتەوە، ئەوجا بام داوە لە ئیعجابم بەو بیروڕایە.

ئەو بۆ خۆیشی بە سەریدا تێپەڕیوە دەبوا هەستی پێ بکات، بەڵام ڕێکەوت من هەستم پێ کرد، ئەمن پێڕەوی هیچ کەسم بە پێڕەویکردن نەکردووە، بەڵام هەر فیکرێك کە بە لامەوە موحتەرەم بووبێ ڕێزم لێ ناوە، هەوڵیشم داوە ئەگەر موحتاج بووم ئەو تەرزە ڕەئیانەی خۆم باس بکەم، دەڵێم فلانیش وای وتوە ئەمما ئەگەر دەلیلی خۆم بەش بکاو موحتاج نەبم، پێی ناوێ لەملاو ئەولا شت بێنم. "عەقاد"یش پیاوێکی زلەو گەورەترین نووسەری عەرەبە لەم زەمانەدا..

***ڕامان:*** فەیلەسوفێ، یا موفەکیرێ لەم جیهانەدا نییە کە پێی موتەئەسیر بووبی؟

مەسعود محەمەد: قەطعەن، کەس نییە بە غەیری ئیمان بە حەق کە لە منداڵییەوە لە بابمەوە بۆم ماوەتەوە، ئەگینا من پێڕەوی هیچ کام لەوانەم نەکردوە کە خوێندومنەتەوە، من سەرچاوەم نییە زیاتر تێدەفکرم، "ئاسۆس کەمال" بە خێری خۆی قاموسێکی فەلسەفی "٨٠٠–٩٠٠" وەرەقەیی بۆ ناردم.. هەرچی فەلسەفەی دنیایە تێیدایە، من پێشتر شتی وام نەبووە، یەك کتێبم نییە لە کتێبەکانی برتراند رسل جگە لە کتێبی "هل للانسان مستقبل" ئەویش "عەلی حەیدەر سلێمان" بۆی ناردووم، لەگەڵ یەك دوو ڕیسالە لەسەر ئەنیشتاین.. ئیتر هیچم نییە.

***ڕامان:*** کەچی تۆ بەوە ناسراوی کە یەکێکی لە خوێنەوارە ناسراوەکانی کورد، کە تەنانەت موتابەعەی زۆر لە گۆرانیبێژەکان دەکەی پێیان موعجیبی، ڕۆشنبیری مەوسوعی جەنابت لەوەوە هاتووە کە بایەخ بە زۆر بواری ڕۆشنبیری دەدەیت، ئێستاش کە دەڵێی سەرچاوەم کەمە یا خوێندنەوەم زیاتر تەئەمولییە، ئەوە چۆن تەفسیر دەکەی؟

مەسعود محەمەد: بڵێم چی من ئەوهام بۆ نمونە دەزانم زمانی عەرەبی عێراق ئەوەی کە قسەی پێ دەکەن زمانێکە لەگەڵ ئاواز ڕێك ناکەوێ، چونکە موخالەفەی هەموو قەواعیدی فۆنۆلۆجی عەرەبی دەکەن، نەك هەر عەرەبی، کوردیش هەروایە، بۆ نموونە دەنگی /ن/ بە وەستاوی لە پێش /ت/ یان /د/و /گ/ نابێ کەسرەی موختەلەسەی بدەیتێ، مەسەلەن وشەی "بنت" بەغدایی شەیدای ئەوەیە بڵێ "بیـ/نت" دەیکاتە دوو بڕگە، ئەوە وەك دومەڵ وایە کەسرەی موختەلەسە دەکاتە "ی" یێکی درێژ، ئەو گۆرانیبێژەی ناوی سەعدون جابرە، "شەمس" دەکاتە "شەمیس" خوا عافووت بکات، ئاخر میمەکە تەحەمووڵی کەسرەش ناکات، دەزانم لوغەتی وەك ئێستەی عەرەبی عێراق کە هەیە لوغەتی مۆسیقا نییە، وا نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە، میسرییەکان ئەو کەسرە موختەلەسەیان لە زمانی خۆیاندا کوشتوەو وشە بە لوسو ڕەوانی دێتە دەرێ تا دەڵێت– جێمس بۆند میمەکە کەسرەی موختەلیسە داوا دەکاتو "جێ/مس" دەبێتە دوو بڕگە، کە دەڵێن "جێمس بۆند" میمی ساکن لە پێش سینی ساکن کەسرەی موختەلەسە داوا دەکات، ئەوان بۆ خاتری ئەوەی بڵێن –جێمس– سیەکە حەرەکەی دەدەنێو دەڵێن "جێمـ/سی بۆند" تا نەڵێن "مس"، زمانی قاهیرە زمانی مۆسیقاو گۆرانییە بە پێچەوانەی ئەوانەی بەغدا.

ڕامان: وەك ئاگادار بم زۆرجار لە ژیانی نوسیندا تانەو تەشەرت لێ دراوە، بوختانت پێکراوە، پاشقولیان لێ گرتوی ئەو تەحەمولەی کە بەرانبەر ئەو هەموو ڕەخنەیە هەتە هی ئەوەیە کە پێگەیینی وەعیو ثەقافیت هەیە، یان چۆن ئەمە لێك دەدەیتەوە؟

مەسعود محەمەد: خۆم بە سورەتی قەتعی ناهێنمە ئاستی شەڕە جنێو، ئەوە یەك، ئەوانەی جنێویش دەدەن بە لای منەوە نزمن.

***ڕامان:*** ئێستە بەندو باوی بابەتی سیستمی نوێی جیهانی هەیە، تۆ وەك ڕوناکبیرێك بۆ بارودۆخی سیاسی جیهان پێت وایە کورد وەك نەتەوەیەك چی بکا بۆ ئەوەی لەناو ئەو سیستمە نوێیەی کە هەیە پێگەیەکی هەبێ؟

مەسعود محەمەد: کوردەکە دەبێ هێشتان لەگەڵ خۆی ڕێك بێو براکوژیو ئەو خیلافاتو شتانە لەناو ببات‌و سلێمانیو هەولێر یەك بگرێو ئەوسا قسە لەوە بکەین چی بکەینو چی نەکەین، دەبێ واقیعی بین..

***ڕامان:*** کێشەی شەڕی ناوخۆ ڕەنگە قۆناغێکی کاتی بێ.

مەسعود محەمەد: ئاخر تا شەڕی ناوخۆ ئاوها بێ جارەك ئەتو کە پارەت نەبێ خانووت پێ ناکڕێ، دەبێ ڕاوەستی تا پارەت پێ پەیدا دەکرێ، یاخود خوا نەخواستە نەخۆش بیت.

***ڕامان:*** ناکرێ ئامادەیی وەرگرینو بیری لێ بکەینەوە تا جێیەکمان لە ناو ئەو وەزعەدا هەبێ..؟

مەسعود محەمەد: ئارەزووت لێ هەبێ دەتوانی تێبفکری، دەتوانی خۆت خەریك بکەی بە تەفسیرو تەفکیر ئەهلەن وەسەهلەنو ڕۆشنبیری خۆتی پێ دەوڵەمەند بکەیت دەستت خۆش بێ، بەڵام بە قەناعەتم موحاوەلە مەکە بە شکڵی عەمەلی خەریکی ئەو مەوزوعە بین، چونکە ئەو بەزمە فایدەی نییە، ئیللا مەگەر ئەو وەزعەی کورد چاك بێ، ئەو شەڕە جنێوەو بەزمو قسە قۆڕانە نەوەستێ، نابێ

خەیاڵ لە شتی خۆشکەڵە بکەینەوە.. بەخێر دوای بەسەرچوونی پلەی منداڵبازاڕی قسەی لێ بکرێ ئەهلەن وەسەهلەن..

*ڕامان:* نزیکبوونەوەت هەیە لە دنیای تەصەوف؟

مەسعود محەمەد: تەصەوف وەك مومارەسە هیچم نەکردوە، بەڵام ئەو گۆشەگیرییەو ئەو بیرکردنەوەی قوڵی بەردەوام بۆ ساڵێك‌و دوو ساڵ‌و بیست ساڵ وای کردوە، کە شەفافیەتێکی لایەنی تەصەوفی لە مندا خەڵق کردبێ.

*ڕامان:* هیچ نووسینت لەو بوارەدا هەیە؟

مەسعود محەمەد: نەخێر، بەڵام ئەگەر ڕێم هەبایە دەمتوانی شتێك لەسەر ئەو بابەتە بنووسم، هەندێ ئەشعاری تەصەوفی هەیە، لەکن من لووتکەی ئیبداعە...

*ڕامان:* یەك دوو وتاری ئێوە لە بارەی شیعری "مەحوی" بڵاو کرایەوە، شارەزایی زۆری پێوە دیارە لەم بوارەدا، تۆ کتێبێکت هەیە بە ناوی "چەپکێ لە گوڵزاری نالی" کە یەکێکە لەو کتێبانەی لە ئەدەبی کوردی دەربارەی نالی بایەخی خۆی هەیە، ئەو کتێبە بەڵگەی ئەوەیە کە جەنابتان شارەزایی باشتان لە شیعری کلاسیکی کوردی هەیە، بۆچی شاعیری تریشتان بەسەر نەکردەوە؟

مەسعود محەمەد: جارێ "نالی" م تەواو نەکردوە، ئیستە نووسینێکم هەیە ڕەنگە "٢٥٠" لاپەڕەیەك دەربچێ کەمتر یا زیاتر لە سوید، پێداچوونەوەیە بە شەرحی "دیوانی نالی"ی مەلا عەبدولکەریمی بیارە. لەوێ هەموو ئەو شەرحانەی کە ئەوان کردوویانەو پێی ڕازی نیم لەم شەرحەدا ئەوەی بە ڕاستی دەزانم نووسیومە، ئێستەش "نالی"یەکە پڕ ناکاتەوە، چونکە گەلێك بەیتی هەیە ئیتر لەبەر ئەوەیە کە دەقەکەی گۆڕاوەو غەڵەتە، یاخود یەکجار سەخت‌و سفتەو تا ئێستەش مانای حەقیقی بەدەر نەکەوتوە، بێگومان من بۆ خۆم ئەوەم کردوە کە ئێستە لە سوید ڕەنگە لەژێر چاپ بێ، زۆریش لەو شتانەم ڕوونکردۆتەوە کە مەلای مودەریس‌و کوڕەکانی تێیدا بە سەهو چوون..

*ڕامان:* نیازت نییە لەسەر شێخ ڕەزا شتێکی وا بکەیت؟!

مەسعود محەمەد: بەخوا زۆر زەحمەتە، بتوانم تەفەروغ بکەم، ئێستە من لێرەدا دانیشتووم چ ئیش ناکەم، ئەگەر لە بەغدا بوومایە خەریکی شتی تر دەبووم، لەو بەینەدا هەر لە بەغدا خەریکی نووسینی بەشی سێیەمی مرۆڤ و دەوروبەر بووم‌و بۆم ناردن بۆ ئەوروپا، ئەگەر فرسەتم هەبێ بەشی چوارەمیش دەنووسم، مرۆڤ و دەوروبەر نیهایەتی نییە..

*ڕامان:* مامۆستا وەك ئاگات لێ بێ لە کوردستانی عێراق نزیکەی حەفتا گۆڤارو ڕۆژنامە دەردەچێ "بە هەموو شارەکانی کوردستان"ئایا ئەو دیاردەیە بە لای تۆوە حاڵەتێکی شارستانییە، یان جۆرێکە لە ئاژاوەی فیکری‌و نەبوونی بەرنامە؟

مەسعود محەمەد: قوربان، خۆ هەموو شتێك لە کوردستان خۆمان هەر تێکەڵ‌و پێکەڵە، دە توخوا لێبگەڕێ با ئەوەیان زۆر بێ، هەرچی بێ هەر چاکە، با بڵێن جارێ شوانێ یان خاوەنێکی نییە، فەقەت بەچکەی ببێ لە دەشتیش هەر چاکترە..

*ڕامان:* "ئیغتراب-نامۆ بوون" بە مەفهومی فەلسەفی لای جەنابت چی دەگەیەنێ؟ هەن دەڵێن کورد توشی "ئیغتراب" هاتوە. تۆ چۆنی تێ دەگەی، بە تایبەتی ئەگەر بیبەستیتەوە بە وەزعی کوردەوە؟

مەسعود محەمەد: ئیغتراب وغەیرە ئیغتراب بە نیسبەت وەزعی میللەتێکی وەك کوردەوە کە دەستی لە بینەقاقای خۆی ناوە، وەك خۆت دەزانی کە سێ-جاران چوار-جاران کەرتك کراوە، ئەو مەفهومانە ئەگەر عیللەتیش بن لەچاو عیللەتەکەی بە کوردەوەیە خەفیفە، ڕاستەوخۆش نییە فەقەط خەفیفە لەچاو دەردی ئەساسی کە لێناگەڕێ تۆ هەر قسەی دەربارە بکەی، ئەم وەزعەی کە هەیە مەجالی کەم شتان دەدات بەرەو ئیصلاح بچێ، بە داخەوە..

*ڕامان:* جەنابت وەك پێشتر باسمان کرد بایەخت بە زۆر بواری ڕۆشنبیری‌و هونەری داوە، یەك لەو بوارانە ئەوەندەی ئاگادارم‌و "لە گەشتی ژیانت"دا باست کردوەو بەشێکت بۆ تەرخان کردوە، مەسەلەی گۆرانی‌و مۆسیقایەو ئیعجابت بەرانبەر محەمەد عەبدولوەهاب‌و ئوم کەلثوم دەربڕیوە، ڕات بەرانبەر گۆرانی کوردی‌و ئەم بارودۆخەی گۆرانی کوردی چۆنە؟

مەسعود محەمەد: قوربان گۆرانی کوردی، هەڵبەت "في سەلامە" بەڵام لوتکەکەی ئەڵلا وەیسیە..

*ڕامان:* ڕایەك هەبوو لەم دواییەدا ئەڵلاوەیسیشیان وەك گۆرانی یا مەقامی کوردی ئیلغا کردبوو، ئێستە گفتوگۆی وا هەیە کە ئەڵلاوەیسی مەقامی ڕەسەنی کوردی نییە.

مەسعود محەمەد: مامۆستا با شتێکی دی لەو بوارەوە باس بکەم، بە قەناعەتی من عەرەبەکان کە هاتن عێراقیان لە دەست ساسانییەکان دەرهێنا، خۆت دەزانی ساسانییەکان کشانەوە، چوونە "نەهاوەند"، هەموو ئەو وڵاتەی دەوری بەغدایەو خەتێ کە کوردو فارس پێك دەگەن، لە خوار کەرکووك ئەو خەتە چۆڵ بوو لە فارس، تا کوردەکە ڕژا بەرەوخوارتر چوو. نیشتمانەکەی بەرفراوانتر بوو، ئینجا لێرە مەبەستم یەك شتە، ئەوەی سەرنج بدات لە هەموو گۆرانی کوردی ڕۆژئاواو باکور، زەنگوڵە هەبێ لەو خەتی تەماسی وەختی خۆی لە بەینی فارس‌و کورد هەبوە لە باشوری "کەرکوك"و "خانەقین" تەنیا لەوێ ئەو زەنگوڵەیە هەیە، بە ئستثنای دیوی

ئێرانی كە كوردەكە لەگەڵ فارسەكە پێكەویە، دەنا ئەولاتر بێی زەنگوڵە نییە، بەڵام ئەڵلاوەیسیو خاوكەرو تێكەڵكێشو ئای ئایو خورشیدی ئا لەوانەدا، زەنگوڵە هەیە كە جیرانەتی فارس تەئسیری بوە، تۆ بەوە بڵێی ڕەسەن نییە تێی ناگەمو ئەمنیش ئاوای تێدەگەم كە هێندە ڕەسەنە، چونكە زەنگوڵە لە گۆرانی كوردی لەو ناوچەیە بووە كە كوردو فارس بە جیرانەتی پێش هەزارو سێ سەد ساڵ تێیدا ژیاون.

***ڕامان:*** مامۆستا كتێبی "گەشتی ژیانم" كاتی خۆیشی بە زنجیرە بڵاوكرایەوە لەم دواییەش كرایە كتێب، ڕەنگە لەبەر هۆی سانسۆرو ڕەقابەو هەندێ شتت مابێ، ئایا دەتوانی بیكەیتە بەدیلی یاداشتی ژیانت؟

مەسعود محەمەد: وەختی خۆی كە داوا كرا گەشتی ژیانم بنووسم، ئەو دەمە لە گۆڤارەكانی عێراق ناوی مەلا مستەفاو ئیبراهیم ئەحمەدو جەلال تاڵەبانیو عومەر دەبابەو پارتی دیموكراتو ئەو شتانە نەدەنووسران، ئیللا ئەگەر جنێوێكیان پێ بدەی، ئینجا چۆن خۆت لە جنێودان قوتار بكەی؟ چارەیەكم دۆزیەوە: سەرۆكی چەكداران مەلا مستەفایە.. ئەندامە چالاكەكە جەلال تاڵەبانیە.. سكرتێری حزب ئیبراهیم ئەحمەدە.. ئا لەو بابەتانە.. بەعزێ شت قابیلی بڵاوبوونەوە نەبوو، یەك لە حەلەقاتیش چاپ نەبووبوو، چونكە دوو حەلەقە ژمارە پێنجی وەرنەگرتبوو، كە بوو بو گەشتی ژیانم لە سوید نووسییانو چاپیان كرد، یەكیان بەر چاپ كەوتو یەكیان بەر چاپ نەكەوت، ئینجا ئەو حەلەقەیەش ئێستە لەچاپدایە، ئەلبەتە ئەو شتانەم هەمووی روون كردونەتەوە كە بیگۆڕنو بنووسن مەلا مستەفاو ئەوها ئەوها، ئینجا بەعزێ شتی كە نەدەكرا ئەو كات بینووسم یەك لەوانە دانیشتن لەگەڵ نووری پاشا كە دانیشتنێكی دوو سەعاتی بوو، ئەوەشم نووسیوە شتی تریشم بە زیادەوە نووسیوە، ڕەنگە دوو سەد لاپەڕەیەك زیاد بكاتو بگاتە "٧٥٠" لاپەڕە.

***ڕامان:*** لەو كاتەی كە جەنابت ئەندامی كاراو جێگری یەكەمی سەرۆكی كۆڕ بووی لە كۆڕی زانیاری كورد لە بەغدا، پێتان وایە لەو سەردەمەدا لەوێ كارت كردووە ئیشێكتان كردبێ بۆ زمانی كوردیو بۆ زاراوەسازی كە لێی ڕازی بن؟

مەسعود محەمەد: وەڵلا خۆ زۆرمان زاراوە داناوە، خۆم كتێبم لەسەر داناوە ئەوەندەی كە پێمان كرابێ لەو دەسەڵاتەی كە هەبوو، بڕوا بكە هیچ تەقصیریمان نەكردووە، بەڵام بە داخەوە برا یەسارییەكان كەوتنە عینادیمان بە شكڵێكی عەجایب، تا ئەوەی گەیشتە ئاستێك شكاتیان بردە لای بەرزترین ئاستی حكومەتو لەوێ منیان تاوانبار كرد كە كۆڕم كردۆتە لقێكی "ساواكی" ئێران، بە دەلیلی چی؟ بە دەلیلی ئەوەی ئەو كوردە ئاوارانەی لە ئێرانەوە هاتوون، وەك هێمنو جەماعەتی دی، هەموو دەمێ لای منن، كە ئەوانە جاسوسی ساواكن.. ئینجا چەندجاران لە حكومەتەوە لێكۆڵینەوەیان لەگەڵ كردم، یەسارییەكان خوا هەڵناگرێ كوتكێكی باشیان وەشاندو شتێكی باشیان دایە دەست حكومەتو من لاكەوتمو دوایی كۆڕ گۆڕاو لە مەجمەعی عیلمی عێراقی بووە هەیئەی كوردی.. دوای ئەوە هەیئەی كوردیش نەما..

***ڕامان:*** ئێستە پێت وایە ئەگەر كۆڕی زانیاری كورد لێرە لە كوردستان دابمەزرێ بتوانی ئەركو پەیامی خۆی بە شێوەیەكی باش بەجێ بگەیەنێ بە تایبەتی لەم وەزعەی ئەمڕۆ كە پاشاگەردانی زۆر لە بواری نووسینو زمانی كوردی بەدی دەكرێ؟

مەسعود محەمەد: كە هاتمە ئێرە پێش دوو مانگ "كاك مەسعود" تەكلیفی لێ كردم، دوایی دەرچوو وەزارەتی عەدلیش لێی داواكراوە بۆ گەلاڵەیەكی یاسای كۆڕی زانیاری، من بە خۆم ناكرێ شتێك بە دەستەوە بگرم، چونكە ئەگەر من قبووڵی شتێكی ڕەسمی بكەم، ناتوانم بچمەوە بەغدا، ناشمەوێ لە بەغدا ببڕێمەوە، ماڵم لەوێیە، ئیتر ئەو فیكرەیە هەیە، بە نیسبەت ئەكادیمیای كوردی یان كۆڕی زانیاری كورد، یان هەرچی ناوی لێ دەنێی خۆ پێوەندی بە سیاسەتەوە نییە، پێوەندی دەبێ بە كوردایەتیەوە، ئینجا سولەیمانیو جێگەی ترو هەموو ناو عێراق دەبێ دەنگی بگاتێ، داخوا بەشدار دەبن یان نا، ئەگەر كردیان ماڵیان ئاوا بێ، نەیانكرد دە جار ماڵیان ئاوا بێ، بەتەمام بەو بوارەوە سەردانێكی سلێمانی بكەم بزانم ئەوان دەڵێن چی..

***ڕامان:*** قسە وباسكردنی ئەو بوارانەی كە جەنابت نووسینت تێدا هەیە فراوانو زۆرن، گفتوگۆش لەگەڵتان تامو بۆی تایبەتی هەیە، ڕەنگە چەند لەوەش زیاتر تەرخان بكەین كۆتایی نەیەت، بەڵام بۆئەوەی لەوە زیاتر ماندووت نەكەین ئێمە لە كۆتایی ئەم دیمانەیەمان زۆر سوپاست دەكەین..

مەسعود محەمەد: ماڵتان ئاوا بێو منیش سوپاسی ئەو موجامەلەیەی جەنابتان دەكەم، ئینشائەڵلا لە دواڕۆژ یەكتر دەبینینەوەو لە وەختی خۆشترو بەپیتو بەرەكەتتر.

**سەرچاوە:**

گفتوگۆ، ئامادەكردنی ئازاد عەبدولواحید، هەولێر ١٩٩٩، لە چاپكراوەكانی دەزگای ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی گوڵان، ژمارە ٢٦.

# الانسان وما حوله

مسعود محمد

في الجزء الاول من كتاب "حاجي قادرى كويى–الحاج قادر الكويى" وفي ثنايا بحثي عن ظروف انتقاله، طفلا، من حياة القرية الى حياة المدينة، عطفت الاذهان الى حقيقة تبدو واضحة بمقارنة ديوان حاجى قادر الى ديوان الشاعر نالى من حيث ان ديوان حاجى قادر يعكس صورة حائلة اللون من رؤى الورد والعشب والريف مما يحمل على ظن قوي بأن حاجي قادر ترك حياة الريف الى المدينة في عمر مبكر لم يتسع لرسوخ صور حياة القرية في واعيته وضميره، لذلك جاءت اصداء تلك الحياة المنبعثة من شعره متناسبة مع مانسمعه من صداها في ديوان اي شاعر حضري، على حين نجد ظاهرة العشب والزهر والريف في شعر نالى غنية متأصلة توحي بأنه قضى كل طفولته وحداثته وصباه بين الزهر والعشب وما اليهما مما تحفل به القرية من صنوف بهيمة الانعام.

فأنت ترى ان هذه المقارنة بين ديواني (حاجى)و (نالى) عزت خطورة كبيرة لتأثير المحيط في دخيلة الشاعر وخياله، فهي في ظاهرها تحكم بانقياد الشاعر، او الانسان عموما، لمقتضى متطلبات البيئة المادية وتصدق مقولة مؤداها ان الشاعر والاديب والفنان هم (مرآة الواقع). ومن هنا لزم لزوم الضرورة ان ارفع يد (الڤيتو) تلقاء مثل هذا التصور لانه تصور يمنح المادة الباردة الميتة مقدارا خطيرا من فاعلية الانسان، ذلك المخلوق المالك للارادة والوعي ومزايا لاتحصى اختص بها الانسان وحده.

وحين اقول: ارفع يد الڤيتو فكأنى اعترض به على نفسي لان الذي اعارضه صدر مني كما صدرت المقارنة مني ايضا، ولكن الواقع هو ان الڤيتو لا يجابهني، وستنكشف لك هذه الحقيقة في الصفحات التالية بلا تأخير، وانما الذي يتحداه الڤيتو هو جبهة عريضة من اصحاب التفكير والتحليل المادي الذين هم وما يبشرون به من فكر سبب انصراف الذهن الى الشك في فاعلية دور الانسان من اقامة مثل المقارنة الآنفة بين ديواني حاجى ونالى فقد حصل منذ زمان مديد ان تراكم الممارسات الفكرية التي دأبت في اخضاع الانسان لمحيطه قد آل بالاذهان الى التهيؤ لاعتبار اي تحليل مادي للاشياء مستدعيا لاقرار عجز الانسان في مقابلة المادة. ولئن كنت لا اضيق فكرا بأهمية المادة ومقام المحيط الواقع والحدث.. الخ في حياة الانسان وتقدمه الاجتماعي وحركة تأريخه وفي كل الحيثيات المتصلة به فاني اجهد في معارضة انقلاب الايمان المبالغ فيه بفاعلية المادة الى مصادرة فاعلية الانسان وخالقيته لحساب المادة فاننا نعلم من امر الانسان انه بالاضافة الى كون جسمه متخلقا من المادة (فهو بهذا يساوي المادة في اقل تقدير) فهو يملك حياة وعقلا وارادة لا توجد في المادة الميتة والمحيط المنجمد وهي حقيقة اولية واساسية في قراءة سفر الاجتماع يكون اهمالها من قبيل اهمال تعلم الابجدية في محاولة القراءة. ومهما اكن متحفظا في اعتبار منحاي الفكري هذا وسيلة لجعل تابعية المادة ومتبوعية الانسان دستورا للاجتماع والتأريخ غير مستند الى التدقيق والموازنة فلن اسامح نفسي ولا ارضى من احد ان يعتبر التخطيط للاجتماع والتاريخ عن سبيل التفكير المادي مؤديا الى قلب الحقائق رأسا على عقب، ومن الواضح ان اكبر قلبة في هذا الميدان هي تركيع الانسان الحي الحساس المريد امام المادة المتصلبة المتخشبة. والذي استغرب له في هذا المجال هو ان المفكرين الذين يهبطون بمنزلة الانسان لحساب المادة يعتبرون انفسهم من محبي البشر وقادته وثواره وهم يتوهمون ان سلخ البشر من جلدة ابداعه وفاعليته وتقديمها الى المادة الميتة هي زيادة تمتين لاساس الفلسفة المادية (الجدلية) التي هي وحدها قاعدة المصلحة والرفاه والتقدم للبشر في نظرهم.

حقا ان هذا النوع من التفكير هو من قبيل الابتهاج بضعف قوة البصر عند الناس لزيادة خطورة العوينات. انا اعلم ان المفكرين الذين يجدون قوة الفلسفة المادية في غلبة المادة على البشر لا يستطيعون ولا يجرأون وربما لا يرضى وهمهم ان يضعوا العوينات وعيني البشر في كفتي ميزان واحد للتقويم والتقدير لما ينطوي عليه ذلك من بؤس وفجاجة تعجز اشد تأويلاتهم التواء وتغليطا ان تضيفها الى دعواهم في حب البشر والريادة والثورية ولكن مهما امتنعوا عن التصريح فان نصوص نظريتهم وتعاليمها ونتائجها الفكرية تقودنا بالضرورة الى تسليط العوينات علىالعيون ويكون عدم اعترافهم بهذه النتيجة نكوصا توجسيا بل انهزاميا من مآل المقدمات التي يعتبرونها رائقة ومتدفقة لنظريتهم: ان عقيدة وفلسفة تشرع منذ بداية تخلقها وانتساجها في توجيه وعودها الريادية نحو وجهة تبشرنا بخيرها وصدقها لايجوز الاقرار بحقها في مطالبتها لنا ان نعض الطرف عن بطلان وعودها أو نتسامح في تنصلها عن خواتيم المقدمات الفكرية التي اقامتها ابتداء لكشف حقائق الاشياء وخفاياها، فنحن في ميدان الفكر والفلسفة لسنا حجارة (الدامة) التي

يحركها وينقلها جهابذة اللعبة حسب قواعدها والحجارة لا تحس بنفسها وتنقلها: اننا بشر نتذكر ما قيل لنا انفا، فاذا دعينا بعد ذلك الى شل احاسيسنا عن عدم تحقق النتائج المنتظرة، فان علينا ان نشدد قبضتنا على وعينا وفهمنا وذاكرتنا حتى لا يختلسوها فاذا حدث شيء بخلاف الوعود المبذولة ساءلناهم عنه فلا نتهاون بتركهم يمارسون علينا خداع النظر وتغليط الاحاسيس حتى لايتمكنوا بالتلبيس والمواربة خلط الاصفر والاحمر والاسود والابيض توصلا منهم الى اختلاس نقطة انتقادنا في مضغ الكلام. لقد اوصى برناردشو طلاب جامعات بريطانيا في واحدة من وصاياه قبل اكثر من نصف قرن ان ينتبهوا الى انفسهم ضد محاولة اساتذتهم مصادرة عقولهم ضمانا لتصديق كل مايقولون. فاذا امكننا ان نقدر او نجرأ على التمسك بوعينا فانا نكون قد نجونا من غالب الحيل الفكرية المنصوبة لنا فتدور الدائرة على اناس صاروا رادة وقادة يشار اليهم بالبنان عن سبيل تهزيء، عقول الناس فيصبحون بعد كشف حيلهم كالمشعوذ الذي يدعى العلم بالغيب حين يظهر بطلان نبوآته فانه بمثل ما نرفض التأويل المتكلف من شيخ طريقة خابت نذره بحلول القيامة في ايام معدودات كذلك نرفض من الفيلسوف الذي رجح مقام المادة على مقام البشر ان يتملص من النتائج الممجوجة لفلسفته فنثابر على مجابهته ومجابهة فلسفته بها لعل الناس ينجون من ضجيجه المضلل.

ما من شك في ان فاعلية ترصدنا لما يقوله اصحاب الفلسفات لاتنحصر في هذا الميدان المحدود من تقابل (المقدمة والنتيجة) في نظرياتهم بل ان فاعليتها في كل ميادين الاجتماع والتطور والنضال الفن والادب والعلوم تتجاوز حد الضرورة لتصبح من مستلزمات البرهنة على انسانيتنا واحترام ذواتنا والازدهاء بوجودنا من حيث ان هذه البرهنة مرتبطة بالمواقف التي نكون فيها احرارا وشجعانا محتفظين بكامل الاختيار فيما نرضى ونرفض: اني اذ اكابد شعور الضيق والقلق فيما اراه من انقلاب ملايين الناس الى ما يشبه لعب الاطفال الفاقدة للارادة في ايدي مبتدعي موديلات الملبس فيلفون قاماتهم في خرق القماش بفرضها على اذواقهم وجيوبهم فان ضيقي يتضاعف كثيرا حين ارى جمهرة المثقفين والثوريين والمناضلين والادباء والفنانين ينقلبون الى طين صناعي طيع في يد اصحاب الفلسفات، وعلى حسب ما تتبدل انغام فلسفاتهم يتبدل اولئك الجمهور الى اقصر واطول واعرض وارفع واشد احمرارا وبياضا ومن كل الصفات حتى لايكادون يعرفون من طور الى طور. انا لااطلب من احد ان يمتنع من الايمان بأي شخص وبأي شيء: انا اوصيه باحترام ايمانه عن سبيل تصديه وتجريمه لاي التواء يكتشفه في الفلسفة التي اتخذها محور قناعته... اقول له لا تصبح درويشا لفلسفات اواخر القرن العشرين. وكان احترامي لقدسية الرأي الحر هو الذي قادني الى مراجعة ما أسلفت من التقويم والمقارنة (بين ديواني حاجى ونالى) كي انفض منهما احتمال التوهين في شأن خالقية الانسان وارادته.

ان ملاحظة التخوف من (توهين شأن الانسان) جراء المقارنة المذكورة بين الديوانين اقلعت بقلمي حالا من متابعة البحث في موضوع (حاجى) و صرفتني الى توضيح حقيقة المسألة في (الفاعلية والانفعال) بين الانسان والمادة بحسب مايظهر لرؤيتي. فلما انتهيت من توضيحها وجدته قد استغرق نحوا من ثمانين صفحة فاضطررت الى استلالها من الموضوع الاصلي ولكني في الجزء الاول نفسه من الكتاب المذكور وتحت عنوان "بحث جانبي مهم" شرحت الكيفية في الصفحة ١٥٦ وما بعدها الى بضع صفحات مضيفا الى الشرح نموذجا من ذلك البحث مع وعد مني في نهاية ذلك بنشر الكتابة المذكورة قريبا "ما لم يجبهني فيها عائق اقوى من استطاعتي".

والكتابة المعنوية بـ"بحث جانبي مهم" ضمن موضوع الجزء الاول لكتاب (حاجى قادرى كويى) تعود بدايتها الى اوائل سنة ١٩٧٢ ولكن الجزء الاول من الكتاب نفسه وبضمنه البحث الجانبي لم يسنح له الطبع فجاء الفراغ منه وحصل نشره في يوم رفع الستار عن تمثال حاجى في كويسنجق وصادف ١٩٧٣/١١/٢٩. والذي كان تحت عنوان البحث الجانبي تراخى الى هذا اليوم (سنة ١٩٧٧) وهو اذ ينشر الان فهو يقطع المجال امام الجزء الرابع من كتاب (حاجى قادرى كويى).

ولابد من القول هنا بان الكتابة المذكورة طالت الى اكثر من ضعفيها بحسب اقتضاء توضيح مواضيعها وحوت احداثا استجدت بعد ١٩٧٢ وتوسعت الى مقارنات وتصورات اقتضاها التعمق وزيادة الشمول وهي كلها من رشح فكري ولكن الصدف لم تنفرج عن امكان نشرها في الماضي. على ان مجموع ماهو منشور في هذا الكتاب من آرائي وتصوراتي قليل من كثير في ميدان شد الحبل بين (المادة والانسان–الطبيعة والعقل) حوتها صفحاته في تفسير الاجتماع.

أرى من باب زيادة التوضيح لمنبع الموضوع الذي وقع تحت عنوان (بحث جانبي مهم) ان انقل صفحات من الجزء الاول لكتاب (حاجى قادرى كويى) كانت ذات علاقة بفتح الباب على ذلك البحث الجانبي وبعدها اشرع في كتابة البحث الجانبي (الذي صار كتابا بعنوان "الانسان وما حوله").

بعد التحقيق في تحديد مكان وميلاد حاجى قادر انتقل الى جدل فكري خاص بي يلتبس بمادة التحقيق. هذا الجدل يبدأ في اوائل الصفحة ١٤٩ من كتاب (حاجى قادرى كويى) على النحو الذي يراه القارىء فيما يلي مباشرة:

"هذه الامور التي عرضتها على القاريء هي جملة الاقوال والاراء المتباينة في تاريخ ومحل ولادة حاجى قادر وسنة انتقاله من القرية الى كويسنجق. بقي كلام خاص بي، في شكل ملاحظة، بصدد تحديد سنة انتقاله وقد اشرت اليه آنفا وسميته "دليلا ذهنيا". والكلام المشار اليه يستند من حيث الاساس الى التواتر ولكن هذا الدليل الذهني يقوم مقام العكازة في تثبيت قامته بلا اهتزاز: ان شبحا ناصلا حائل اللون شبيها بعبث الاحلام او هذيان المحموم الذي هو موجود ومعدوم.. تراه العين ولا تراه، يتخايل للبصر الذي يلمح الخيال الموهوم وتحسه رهافة الجرح الملتهب، واليك البيان:

"كأني بـ(نالى) قضى كل طفولته وصدرا من عمره بعد ذلك يكفي ليتخلق باخلاق القرية، قضاها في شهرزور و"خاك وخول–قريته" وفضاء الريف وتأصل خلالها في اعراف الفلاحة فصارت لديه مشاغل

الحرث الاول والثاني وفنون البذار والحصاد ونصب البيدر ورفعه وسائر اعباء الزراعة "طبعا مكتسبا" وآلت أسماء الاعشاب والنباتات وانواع الورود والزهور الى قاموس بدائي لبغام الطفولة وانطبعت حياة الريف واحوالها ومظاهرها في صفحة ذهنه وحسه كالنقش المحفور. فالمرجح ان يكون ذلك سببا في ان مواضع كثيرة من ديوانه تلمع فيها الزراعة والحبوب والحرث والتقليب والبهيمة والزهر والعشب كما يبرق اللؤلؤ والجوهر المنعكس من عقد نضده خبير ماهر. ان حوار نالى مع فضاء الريف والزهر والنبات والبهيمة اشكل بشخص متمرس في القرية وليس بشاعر خيالي. فالتفت معي الى دور حبة "الشلب" في البيتين الاتيين (يأتي البيتان ولم أرى ضرورة لترجمتهما) ثم تأتي الصفحات ١٥١، ١٥٢، ١٥٣، بنماذج من شعر نالى انشغلت كلها، عن قرب، بحياة القرية ووصف العشب والزهر والبهيمة، بعدها يستمر البحث من السطر الاخير في الصفحة ١٥٣ على النحو الاتي:

"في هذه الابيات وفي مواضع اخرى كثيرة ليس "نالى" ذلك الشاعر الذي يذكر الزهر والشجر عن طريق اطلاعه على اسمائها في القواميس والكتب او سماعه اياها من افواه الناس.. كلا بل انه رجل ريفي شد منها الاضمامات مئات المرات ونام عليهن وتقلب بهن من جنب الى جنب. ليس من السهل ان يمر في ذهن الشاعر تشبيه اللسان بال"سوسن الندى الريان" او يمثل احدى عيني الحولاء (في مقام المدح) بالبنفسج قبل تفتحه ويمثل الاخرى بالنيلوفر (المنفتح) او ان ينقل من نوار اكتنفه الندى منثورا ومنظوما صورة للثغر واللسان واللثة والاسنان. فاقول انه فضلا عن قدرته الشعرية واحساسه المرهف وفكره الدقيق فقد ساعدته "المعاشرة" على بلوغه مراتب الاعجاز في وصف الزهر والعشب والشجر وهي السبب ايضا في كثرة ارتماء هذه الرؤى الى داخل قصائده.

"هذه الظاهرة النباتية بوجهيها "الكمي والكيفي" لا تبين في ديوان حاجى قادر. صحيح ان الزهر والعشب والفاكهة والريف لها وجود في ديوان عامة الشعراء ولكن شتان ما بين وجود بالصدفة او بالتفحص والتكلف وبين وجود بالانبعاث الذاتي حتى يبدو كجزء من طبيعة الشاعر وضميره. فبقدر مايكون الشاعر قد صاحبهن عن قرب يأتي ذكره لهن وتوظيفهن للمعنى والترسيم احفل بالمهارة. و واضح انه كلما كانت هذه الصحبة في بدايات عمر الشاعر جاء تخلقه بها اقوى وتشرب مزاجه لها اعمق. من هذا اذهب الى ان نالى قضى طفولته وحداثته كلها في قرية (خاك وخول) وفي الريف بين العشب والزهر والبهيمة. ومن طريق (مفهوم المخالفة) قياسا يكون خفوت وقلة الظاهرة النباتية في ديوان حاجي قادر راجعا الى انه لم يعش طور طفولته المبكرة وبدايات حياته في القرية. واستنتج من هذا انه بافتراض ان ولادته لم تكن في كويسنجق فالراجح ان يكون انتقاله اليها جرى في وقت مبكر من طفولته. فالمستخلص من بداهة مقارنة ديوانه بديوان نالى هو انه لم يتسن له في صدر طفولته قربى مع الزرع والزهر والشجر وفضاء الريف فجاء استئناسه بهن اشكل بشاعر حضري. ولكن حاجى نفسه اذ تقيض له ان يصرف بعضا من سني دراسته بين العشائر والرحل تحت الخيمة قريبا من الغنم والنعم ووجد نفسه على مدى عدد من مواسم الربيع في مراتع لاجان وبالك وحول مهاباد وبما عنده من قوة التصوير والتعبير ان يرسم في ربيعيته المشهورة صورة تامة التطابق مع حياة الخيمة ومشغلة ايواء البهيمة وسرح صغارها في رضعات الظهر والمساء وما يماثل ذلك من وعثاء الارتحال في لوحة زيتية باهرة الزينة فيحيط في لمحة العين بالربيع وظعنه وكلب الحي وضامر الخيل والسائمة ومطر السحاب وبروق السماء وطيور الافلاك وتفاصيل هذا الشأن مضمومة مجموعة. فهل كان في امكانه ان يبلغ في تصوير تلك المعيشة وتشابكاتها ومرافقها حد الاجادة والابداع لولا انه عاينها وعايشها؟.

"مرة اخرى اقول، انعم نظرك في وصف الصحراء والرمل وصنوف الشوك من اثلي وعرفج وخطمي وغيره على طريق البيت الحرام في جملة من قصائد "المناجاة" للشاعر نالى وكيف استدرها من ينبوع قلبه: فلا نالى كان قادرا على خلق تلك الاوصاف المعجزة عن سبيل غير سبيل العيان ولا حاجي او غير حاجي كان يمكنه ان يضمن ديوانه وصفا مماثلا لشيء لم تقع عليه عيناه (فهو لم يحج). هذه القوة التصويرية التي ابدع بها نالى قصائده المذكورة لاتطاوع غير آحاد من الافذاذ حتى ولو حجوا البيت فكيف تنقاد لشاعر ما طاف بالبيت ولا قطع المهامه!

"هذه الملاحظات تشجعني على تصديق ما تواتر من رواية تقول ان حاجي انتقل الى كويسنجق في طفولته حيث انفتحت عينه على الدنيا وقطع مرحلة اوائل الدراسة حتى مرتبة التلميذ المتمكن (مرحلة ما بعد الكتاب) فما سمعنا بان حاجى ترك كويسنجق في طلب العلم الا ما كان من ارتحاله الى منطقة بالك (باطراف رواندوز) وكردستان ايران".

بعد هذا المقدار المنقول من كتاب (حاجى قادرى كويى) نصل الى بداية البحث الجانبي المشار اليه في نهاية الصفحة ١٥٦ من الجزء الاول من الكتاب المذكور ثم اخذ منه نموذج من عشرة اسطر فعرض في الصفحة ١٥٨ منه، ولكني اكرر هنا ان ما يصل الى الطبع من ذلك البحث الجانبي اوسع مما كتبته في حينه وأن احداثا ووقائع دخلت فيه لم تكن قد نجمت عند انتهائي منه سنة ١٩٧٢.

واحببت ان تظل الكتابة هذه محتفظة بعنوانها الاصلي كالمظلة الواقية اي ان استهلها تحت سمة "لاباسيَكى گرنگ–بحث جانبي مهم" وقد زادني حبا فيهما ان تعاقب السنين اثبت بالوقائع والتجاريب صدق تصوراتي سواء ما كان منها ضمن ذلك البحث او في الاجزاء الثلاثة كلها من كتاب (حاجى قادرى كويى) ومن باب امتحان اقوالي هذه ارجع الى الصفحات (٢٤، ٢٥، ٢٦..) في الجزء الاول من كتاب (حاجى قادر..) ولك مطلق الحرية في ان تخضع للامتحان اية ورقة او مقولة اخرى وردت في تلك الكتابات.. بأحساس الارتياح الى ما كتبت من مدة السنين ادعوك لقراءة واعادة امتحان.

المصدر:
الانسان وماحوله, مسعود محمد، دار الثقافة والنشر الكردية، الجزء الاول ١٩٩٩ بغداد، دار الحرية للطباعة.

